# فـەرهەنگی تـەقی

## كوردی – كوردی


نووسینی

جەلال تەقی

عوسمان محەممەد هەورامی

محەممەد فاروق محەممەد ڕەمزی

عەبدوڵڵا حەسەن قادر



سلێمانی

٢٠٠٩

سەرپەرشتی گشتی

موحەمەد کوردۆ

# فەرهەنگی تەقی


- ناوی نووسەر : لیژنەیەک
- بابەت : فەرهەنگی زمان
- پیتچنی: ئارام نەجمەدین
- هەلەچنی و نەخشەسازیی ناوەوە : فەرهاد عەلی
- بەرگ : جەبار سابیر
- سەرپەرشتیاری کتێب : ئەکرەم محەمەد ئەمین
- تیراژ : (١٠٠٠)
- چاپخانە : چاپخانەی کارۆ
- نرخ : ([illegible]) دینار
- ژمارەی سپاردنی ( ١٨٦٩ ) ی سالی ٢٠٠٩ی وەزارەتی رۆشنبیریی دراوەتێ

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

ناونیشان: سلێمانی- گردی ئەندازیاران، بەرامبەر

کوردستانی نوێ

ژمارەی تەلەفۆن ٣١٨٠٩٩٤

# پێشەکی

سەوداسەرانی زمان و شارەزایانی فەرهەنگ لەسەر ئەوە کۆکن ، کە نووسین و دانانی فەرهەنگ پرۆژەی تەمەنە .. ئەفسووس ، تەمەن بواری کەمکەس دەدات ئەو پرۆژەیە تەواو بکات و بە ئاوات بگات .

(جەلال تەقی – ١٩٣٩ – ١٩٩٣/٩/٣) ، یەکێکبوو لە سەوداسەرە زۆر پەرۆشەکانی وشە کوردییە رەسەنەکان ..بەداخەوە ، مەرگ بوارینەدا بەتەواو کردنی ئەم فەرهەنگە و چاپکردنی شاد بێت . ئەو بە ئەشق و سۆزەوە لایەکی ماڵەکەی خۆی تەرخانکرد بۆ پرۆژەی نووسینی فەرهەنگێك ، کەسەراپا وشە کوردییەکان ، بەگوێرەی ریزبەندی ، هەموو پیتەکان لەخۆ بگرێت .

لە نێوان کۆتایی ساڵی (١٩٩١) ، تا دوو حەفتە بەر لە نەخۆشیی دڵ و کۆچی دوایی ، لەگەرمەی ئەو گشت نەبوونی و دەستکورتییەدا ، لیژنەی ئەم فەرهەنگە ، حەفتانە و بەشێوەیەکی رێکوپێك ، پێنج رۆژ پێکەوە دادەنیشتین ، رۆژانە بۆ ماوەی (٨)کاتژمێر و پتریش کارماندەکرد – لێرەدا دەبێت بە پێزانینەوە رۆڵی کاریگەری (خاتوو نیعمەت)ی هاوسەری لەیاد نەکەین ، کە زۆر دڵسۆزانە کەشوهەوایەکی لەبار و ئارامی بۆ دەرەخسانین .

پاش تەواو بوونی بەشی پیتی (ئەلف) ، ئەوە بوو بەداخەوە (کاکە جەلال) کۆچی دوایی کرد ... دوای ئەم ماوە دوور و درێژە و سەردانی چەند دەزگایەکی چاپەمەنی ، لەم ئەنجامدا دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی سەر بە وەزارەتی رۆشنبیری ، ئەرکی لەچاپدانی گرتە ئەستۆ ، دیارە بەم هەنگاوە پیرۆزەیان ، گیان و رەوانی (جەلال تەقی)یان شاد کرد و هەناسەی شادیشیان بە ئەندامانی دیکەی لیژنەکە بەخشی .

سەبارەت بەناوی ئەم فەرهەنگە ، بەباش و گونجاو و پێزانین و ئەمەکداریمان زانی ، بەنازناوەکەی (کاکە جەلال)ەوە ناوبنرێت ، واتە (فەرهەنگی تەقی) .

## چەند تێبینیەك :-

*لەسەرەتای نووسینی یەکەمین پیت و یەکەمین وشەوە ، تا کۆتایی ، لە کوێدا پێویستبووبێت ، هێمای ڕێزمانیمان دانابوو ، بەڵام لەبەرئەوەی هێماکان وەك خۆیان نەماون و گەلێکشیان گۆڕدراون ،بەباشمان زانی ئەو هێمایانە لابەین .

*ئەو پەڕی توانامان خستۆتەگەڕ ، بۆ ئەوەی بەڕاڤە واتای وشەکان دەربڕین ، نەك بەتەنیا وشەیەکی بەرانبەر و هاو واتا .

*بۆهیچ وشەیەك نەماننوسیوە چ شێوە زارێکە ، چونکە دیارە زمانی کوردی لەگشت شێوە زارەکان پێکهاتووە و بەهەمووشیان دەوڵەمەندتری دەکەن .. هیچ کوردێکیش بەتەواوەتی و سەراپا وشەکانی گشت شێوە زارەکانی زمانەکەی نازانێت و ناتوانێت جیایانبکاتەوە ، بۆیە ئەو مافەمان بەخۆمان نەدا بۆ هیچ وشەیەك بنووسین چ شێوە زارێکە ..

*بەرانبەر بە هەموو وشەکان کەبەپیتی سریانی (عەرەبی) نووسراون ، بەڕێنووسی لاتینیش نووسراون ، تاکو بەشێوەیەکی ڕاست و دروست فونەتیکیان دەرببڕدرێت .

*بۆ پیتی (ڕ) بەلاتینی ، گەلێك هەوڵدرا ، ئەم نیشانەیە (٨)لە کۆمپیووتەردا دەستنەکەوت ، بەڵام ئەم نیشانەیە (٧) دەستکەوت ، بۆیە ئەم پیتە بەلاتینی بەم چەشنە نووسرا (ř) .. بۆ پیتی (غ)ش ، بەلاتینی ، ئەم نیشانەیە (٨) دەستنەکەوت لەسەر پیتی (X) دابنرێت ، بۆیە بەناچاری لەکۆمپیووتەردا هەر (X)نووسرا .. بێگومان خوێنەری هێژا دەتوانێت بەکارامەیی خۆی ، بەپیتی (غ)دا ل ـویندنەوەی لاتینییەکەدا ، پەی بەهەماندەنگ ببات .

*لەجیاتی وشەی (بڕوانە) ، ئەم کورتکراوەیەمان داناوە(بڕ.).

وەك قسەی نەستەقی پێشینان ، گوتراوە و بەرگوێ دەکەویت (دیاریی شوان یان شنگە ، یان هەڵەکۆك ) ، هیچ کار و بەرهەمێکیش لە کەموکووڕی بەدەر نییە ، بۆیە دەخوازین و بەهیواین ئەم دیارییەمان لێوەربگیرێت و گەلێك سوپاس ....

لیژنەی فەرهەنگ
٢٠٠٨/١٠/١٥

١-ئـ : i.

یەكەم دەنگە لە ئەلفبێی زمانی كوردیدا بە نووسینی ڕێنووسی عەرەبی ، لە گەروومەوە دێتە دەرێ .

٢-ئـ : i..

دەنگێكی پڕ لە ئازارە لە كاتی نەخۆشی و ماندووبوونا بە نزەیەكی كزەوە لە گەروو دێتە دەرێ ، شێوە نكە نكێكە.

٣-ئـ : i..

١-دەنگێكە لە كاتی هەڵوێستەی قسەكردن و بیركردنەوەدا لە وتەیەكی تر، دەردەكەوێ .

٢-دەنگێكە لە كاتی نقاندن و مرقبردنەوەدا لە قوڕگ دەردەچێ.

١-ئا : a

وشەیەكە بۆ وەڵامدانەوە لە كاتی بانگكردندا.

*ئا ، ئەوەیە .

وەڵامی دڵنیاییە بۆ ئەنجامدانی كارومەبەستێك بۆ كەسێكی بچووكتر ، یان دۆستێكی نزیك ، بەواتای بەڵێ .

٢- ئا : a

١- وشەیەكە بارو دۆخێك دەردەخات ، بە پرسیارو سەرسوڕمانەوە دەوترێت .

* ئا ، ئەوە بۆچی وا دەكەیت ؟

٢-وشەیەكە بۆ پرسیار بەسەر سوڕمانەوە دەبێژرێت .

* ئا ئەوە كارەكەت تەواو نەكردووە !

٣-هەڕەشەو گلەیی بە پرسیارو سەر سوڕمانەوە .

* ئا ، ئەوە بووی بەو پیاوەی بەگوێم نەكەیت ؟!

٣-ئا : a

ئامرازی هاندان و بزواندنە ، لە سەرەتای ڕستەوە دەوترێت .

* ئا خێراكە بابڕۆین .

٤-ئا : a

بۆ دەستیشانكردن و پێداگرتن لەسەر خواست و مەبەست .

* ئا : ئەمە داواكاریمە ، نایگۆڕم .

٥-ئا : a

ئامرازی ئاماژەیە بۆ پیشاندان و دەستنیشانكردنی شتێك ، شوێنێك ، كەسێك. *

ئا ، ئەوە براكەمە .

٦-ئا : a

كورتكراوەی وشەی ئاغایە .

٧- ئا : a

ڕاناوی مێیینەیە لە كرمانجیی ژووروودا .

٨-ئا : a

وشەی سەرسوڕمانە لە ئەنجامی بیستنی هەواڵ و ڕووداوێكی سەیر و سەمەرە و چاوەڕواننەكراودا .

a ٩-ئا :

بۆ برە و پەیداکردن بۆ شتێ .

ئا ئەمەیە ترێی ئایاب !.

a ١٠- ئا :

جێناوی سەربەخۆی کەسی سێیەمی تاکەبۆ دەستنیشانکردن و پیشاندانی کەسێك ، گیاندارێك ، شتێکی دوور .

* ئا کتێبەیە بارە :

a ١١- ئا :

بۆ پرسیارکردن بەسەرسوڕمانەوە .

بەکاردێت ، لە ئەنجامی تێنەگەشتنی مەبەستدا.

a a .. ئا ئا:

ئامرازێکە بۆ تەواو سەلماندنی .شتێك ، یان ڕووداوێك .

* ئا ئا ، ڕاستەکەی وایە ..

a ane ئائا نە : (ئائەوە)

بڕ . ئا ئەوە .

a ani ئائانی :

بڕ. ئا ئەوە ، (بۆ مێ) .

a egre ئا ئەگرە :

بڕ . ئا ئێرە

a emane ئا ئەمانە :

ئامرازی ئاماژەیە بۆ کەس و شتی کۆ و نزیکی دیاریکراو ..

aeme ئا ئەمە :

ئامرازی ئاماژەیە بۆ کەس و شتی تاك و نزیکی دیاریکراو

a emende ئا ئەمەندە :

ئامرازی ئاماژەیە بۆ دەستنیشانکردن و دیاریکردنی چەندێتی و قەبارەی شتی نزیك ..

a ewane ئا ئەوانە :

ئامرازی ئاماژەیە بۆ کەس و شتی کۆی دوورو دیاریکراو .

* ئا ئەوانە پیاوانی دوارۆژن .

a ewe ئا ئەوە :

ئامرازی ئاماژەیە بۆ دەستنیشانکردنی کەسێك ،یان شتێکی تاکی دوور.

a ewende ئا ئەوەندە :

ئامرازی ئاماژەیە بۆ دەستنیشانکردن و جیاکردنەوە و دیاریکردنی قەبارە وچەندێتیی شتی دوور.

a ewyane ئا ئەویانە : (ئا ئەویانە)

بڕ .ئا ئەوێ ..

ئائەوێ : a ewê

ئامرازی ئاماژەیە بۆ دیاریکردنی شوێنی دوورو دەستنیشانکراو .

* ئا ئەوێ جێگای تۆیە .

ئا ئەیرانە : a eyrane

بڕ . ئا ئێرە .

ئائل : a il

کار و قسە و قسەڵۆکی نا بەجێ و ناڕەوا...

ئائلبوون : a ilbûn

کردنی کارو کردەوەی نا دروست و ناڕەوا ، بەزۆرە ملێ

ئا ئلی : a ilî

کاروکردەوەی پڕ لە زۆر و ستەم ..

ئائیگە : a îge

بڕ . ئا ئێرە .

ئا ئینە : a îne

بڕ . ئا ئەمە

ئائینی : a îni

بڕ . ئا ئەمە ( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .

ئا ئێرانە : a êrane

بڕ . ئا ئێرە .

ئا ئێرە : a êre

ئامرازی ئاماژەیە بۆ شوێن و جێگای نزیکی دیاریکراو .

ئا ئیگە : a îge

بڕ . ئائێرە .

١- ئاب : Ab

هەشتەمین مانگی ساڵی گریگۆری ( ڕۆژ ئاوایی ) سی و یەك ڕۆژە .

٢-ئاب : ab

بڕ . ئاورنگ .

٣- ئاب : ab

پرشنگ و شەوق و بریسکەی شتی بریقەدار لە ئە نجامی بەرکەوتنی تیشك و ڕووناکیدا .

٤-ئاب : ab

ئاو ، شووشە ... هتد کە پاك و بێگەرد و ڕوونبێ .

ئابا بۆز : ababoz

بڕ. ئەبابۆز .

ababozî
ئـابا بۆزی :
بڕ . ئەبا بۆزی .

abat
ئـابات :
پاشگرێکە بەناوەوە دەلکێت . واتای ئاوەدانکەرەوە دەگەیەنێت وەك : عەلیئابات.

abad
ئـاباد :
بڕ . ئابات .

abacî
ئـاباجی :
خوشکە گەورە

abadan
ئـابادان :
بڕ . ئاوەدان

abadanî
ئـابادانی :
بڕ. ئاوەدانی .

abadker
ئـاباد کەر :
١-کە سێکە کەسی خۆی لەمافی کەسایەتی بێبەشبکات و پەیوەندیی کۆمەلأیەتی و خزمایەتیی نێوان ببچڕێنێ .
٢-کەسێکە کە دان نەنێ بەتاوان و ڕووداوێکدا، کە درابنە پالی .

abadkere
ئـابادکەرە :
بڕ. ئاباد کەر ( بۆ مێ ) .

abadkerdey
ئـاباد کەردەی :
بڕ. ئاباد کردن .

abadkirdin
ئـاباد کردن :
١-بێبەشکردنی خزم و کەسوکاری نزیك لە مافی کەسایەتی و نەهێشتنی پەیوەندیی کۆمەلأیەتی و خزمایەتی لە نێوانیاندا
٢-پێنەهاتن و دانەدواوەی تاوانێك کە درابێتە پالْ مرۆڤ.
٣-دەستبەدار بوونی ژن لە پیاوەکەی.

abadlêkiraw
ئـاباد لێکراو :
بێبەشکراو لەلایەن کەسوکارەوە لە مافی کەسایەتی و پەیوەندیی کۆمەلأیەتی .

abadlêker
ئـاباد لێکەر :
بڕ. ئاباد کەر

abadlêkirdin
ئـاباد لێکردن :
بێبەشکردنی کەسوکار لە مافی کەسایەتی و پچڕاندنی پەیوەندیی کۆمەلأیەتی لە نێوانیاندا.

abadwenekirya
ئـاباد وەنەکریا :
بڕ. ئاباد لێکراو .

abadî
١-ئـابادی :
بڕ ئاوایی .

abadî
٢- ئابادی :
بڕ. نۆبه -١
abaÎ
١- ئابالْ :
سۆراخ و بەدوادا گەڕان .
abaÎ
٢-ئابالْ :
گەڕانەوە لە شوێنێکەوە بەرەو دواوە .
abaÎbûn
ئابالْبوون :
وازهێنان لە ڕێباز و بیروباوەڕ و بۆچوونی لەوە و پێش .
aban
ئابان :
١-هەشتەمین مانگی سالْنامەی ئێرانییە لە ( ٢١ )ی تشرینی یەکەمەوە هەتا ( ٢٠ ) ی تشرینی دووەم دەگرێتەوە.
٢-بورجی دوو پشك .
abaherza
ئابا هەرزان :
١-ئارەزووی کەمبوونەوەو دوورکەوتنەوەی مێرد لە ژنەکەی.
٢-لێکجیابوونەوە و دەسبەردار بوونی ژن و مێرد بەداب و دەستووری شەرعی و یاسایی .
abenûs
ئابەنووس :
بڕ. ئەبەنووس .
abco
ئا بجۆ :
٢-خواردنەوەیەکە لە ئاوی جۆ دروستدەکرێ ، ڕێژەیەکی کەم کحوولی تێدایە.
١-ئاوی گیراوەی جۆ ، بەبێکحوول ، بۆ فرێدانی بەردی گورچیلە بەکاردێ.
abcî
ئا بجی :
١-زایندەی مێ لە هەمان دایك و باوك ، یان لە دایکی لە شوویەکی تر ، یان لە باوکی لە ژنێکی تر.
٢-کچێك کە هاوشیرەی کچێك ، یان کوڕێك بێت ، کە لە دایك و باوکی خۆی نەبێت ( خوشکی شیری ).
abxane
ئا بخانە :
شوێنێکی دەورگیراوی تەرخانکراوە بۆ خۆ بەتاڵکردنەوە ، بەشێوەیەکی سروشتی .
abdar
١-ئابدار :
بڕ ئاودار
abdar
٢-ئابدار :
بارگیرێك بارەکەی سەوزەبێ .
abdarbaşî
ئابدار باشی :
سەرگەورەی قافلە و ڕەوەی ئابداران .
ئابدارخانە :
بڕ. ئاو دارخانە .
abdest
ئابدەست :
بڕ. ئا بخانە .

abdestxane

ئابدەسخانە :

بر: ئابخانە :

abdesxane

ئابدەسخانە :

بر. ئابخانە .

abra

ئابرا :

برا گەورە لە ( ئاغابرا ) وەهاتووە .

abřû

ئابڕوو :

١-هەستی هەڵسوکەوتی مرۆڤ بەرانبەر دەوروبەر لە شوێنێکی گونجاو و دیاریکراو دا .

٢-ڕەونەق و ورشەو گەشەی ڕوو .

٣-شەرم و حەیاو ئامووس .

abřûber

ئابڕووبەر :

١-کەسێکە کە ناوی خەڵك دەزڕێنێ و لەکەدار و خەوشداریان دەکات .

٢-کاروکردەوەیەك کە سووکی و نەنگی بەسەرخەڵکدا دەهێنێت و لەکەداریاندەکات .

abřûbere

ئابڕوو بەرە :

بر . ئابڕووبەر .

abřûbiran

ئابڕووبران :

بر . ئابڕوو تکان .

abřûbiraw

ئابڕوو براو :

١-مرۆڤێکە کە ناوی زڕابێ و سووك و ڕیسوا کرابێ

٢-کەسێکە کە بەناڕەوا پڕوپاگەندەی خراپی بۆ هەڵبەسترابێ .

abřûbirdin

ئابڕوو بردن :

١-سووککردن و ناوزڕاندنی مرۆڤ بە قسەڵۆك و کار وڕەفتاری بەدو ناپەسەند بۆ بە پەندکردنی .

٢-دەستدرێژیکردن بۆ ئامووسی نێر ، یان مێ .

abřûbirya

ئابڕوو بریا :

بر . ئابڕوو براو .

abřûbiřyag

ئابڕووبڕیاگ :

بر . ئابڕوو براو .

abřûbiryaw

ئابڕوو بریاو :

بر . ئابڕوو براو .

abřûtikan

ئابڕووتکان :

بر . ئابڕوو چوون

abřûtikandin

ئابڕوتکاندن :

بر. ئابڕووبردن .

ئابڕوو تکانن : abřûtikanin

بڕ . ئابڕوو بردن .

ئابڕووتکاو : abřûtikaw

بڕ . ئابڕوو چوو .

ئابڕووتکێن: abřûtikên

بڕ . ئابڕوو بەر .

ئابڕووتکێندراو : abřûtikêndiraw

بڕ . ئابڕوو براو .

ئابڕووتکێنراو : abřtikênraw

بڕ . ئابڕوو براو .

ئابڕوو چوێندراو : abřûçiwêndiraw

بڕ . ئابڕوو براو .

ئابڕوو چوێنراو : abřûçiwênraw

بڕ. ئابڕوو براو .

ئابڕووچوو : abřûçû

١-کەسێکە بە پڕو پالأنتەو قسەی نارەوا ناوی زڕێنرابێ و پلە و پایەی کۆمەلأیەتیی هاتبێتە خوارێ .

٢-کەسێکە لە نەنجامی وتەو کارو ڕەفتاری ناپەسەندا سووك و ڕیسوا بووبێ .

ئابڕووچووگ : abřûçûg

بڕ. ئابڕووچوو .

ئابڕووچوون : abřûçûn

سووکبوونی مرۆڤ لەناو کۆمەڵدا لە نەنجامی کارو ڕەفتاری خراپدا .

ئابڕوودار : abřûdar

مرۆڤی خاوەن ئابڕوو .

ئابڕووداری : abřûdarî

بوون بەخاوەن ڕێزو شەرم و فەڕ و نموون لەناوکۆمەڵدا .

ئابڕوو ڕژاندن : abřûřjandin

بڕ. ئابڕوو بردن .

ئابڕوڕژانن : abřûřjanin

بڕ . ئابڕوو بردن .

ئابڕوومەند : abřûmend

بڕ. ئابڕو دار .

ئابڕوومەندی : abřûmendî

بڕ. ئابڕووداری .

ئابزوون : abzûn

بڕ. ئەزموون .

ئابزوونکردن : abzûnkirdin

بڕ. ئەزموونکردن .

ئابگینە : abgîne

بڕ. ئاوێنە .

قەط مومکینە ئاب و ئابگینە

ئەڤ ڕەنگە نەکەت قبولی کینە ؟! ( ئەحمەدی خانی )

ئابگینەك : abgînek

بڕ. ئاوێنە .

ئابلووقە : abÎûqe

١-گەمارۆی هێزی دوژمن بەنیازی لەناوبردن ، یان ناچارکردن بۆ خۆ بەیدەستبوون.

٢-گەمارۆی وڵات و شارو ... هتد بەنیازی ڕێگرتن و پچراندنی پەیوەندییان لەگەڵ دەرەوەدا .

٣-ڕێگرتن و قەدەغە کردنی هێنان و بردنی خواردەمەنی و کەلو پەل و ...هتد .

ئابلووقە خستنە سەر : abÎûqexistneser

بڕ. ئابلووقە دان .

ئابلووقە دان : abÎûqedan

بڕ. ئابلووقە .

ئابلووقەدای : abÎûqeday

بڕ. ئابلووقە .

ئابلووقەدەر : abÎûqeder

کەسێك ، هێزێك ، یان دەوڵەتێك کە ئابلووقەی کەسێك ، یان هێزێکی ..... هتد ، دابێ .

ئابلووقەدەرە : abÎûqedere

بڕ. ئابلووقە دەر ( بۆ مێ ) .

ئابلووقەدراو : abÎûqediraw

کەسێك ، کۆمەڵێك کەس ، ناوچەیەك ، یان وڵاتێك کە هێزێك گەمارۆیدابێ .

ئابلووقە دریا : abÎûqedirya

بڕ. ئابلووقە داو .

ئابلووقە دریاگ : abÎûqediryag

بڕ. ئابلووقە دراو .

ئابلووقە دریاو : abÎûqediryaw

بڕ. ئابلووقە دراو .

ئابلوقە دریێ : abÎûqediryê

بڕ. ئابلووقە دراو ( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .

abÎûqewistey ser
ئابلووقە وستەی سەر :
بڕ. ئابلووقە دان .

abne
ئابنە :
لوولەی نێرگەلە ، کەسەرێکی بەدەم نێرگەلەکەوەیە ، سەرەکەی دی دەچێتە ناو ناوی نێرگەلەکەوە، بەهۆیەوە دووکەڵی تووتنەکە هەڵدەمژرێ .

abusten
ئابوستەن :
بڕ. ئاوس

abor
ئابۆر :
بڕ. ئابوور

aburîzan
ئابوریزان :
بڕ. ئابوورزان .

aburîzanî
ئابوریزانی :
بڕ. ئابووریزانی .

aburînas
ئابوریناس :
بڕ. ئابووریزان .

aburînasî
ئابوریناسی :
بڕ. ئابووریزانی .

abune
ئابونە :
مرۆڤی کەتەو زەبەلاح .

abûde
ئابوودە :
بر : ئابیدە .

abûr
١-ئابوور :
١-پێداویست و کەرەستە و هۆی ژیان.
٢-ڕێباز و ڕێکخستنی ژیان .
٣-هەبوونی پێویستیەکانی ژیان .

abûr
٢- ئابوور :
١-بڕ. ئابڕوو .
٢-داوێنپاکی و ڕەوشتبەرزی .
٣-بێفیزی و بێهەوایی .

abûrkirin
ئابوورکرن :
دابینکردن و ئامادەکردنی کەرەستەو پێداویستیی ژیان و گوزەران .

abûrî
ئابووری :
١-داهاتووی بەروبووم و دەسکەوت و پاشەکەوتی وڵات و کۆمەڵ و مرۆڤ .
٢- پلانی ڕاگرتنی ڕێکو پێکی و دانانی ڕێباز بۆ ڕێکخستنی داهات و خەرجی وڵات و خێزان ... هتد.
٣-هونەری بەڕێوەبردنی دارایی وڵات و ناو ماڵ و خێزان بە پارە و بووجەیەکی دیاریکراو .

abûrîzan
ئابووریزان :
کەسێکی شارەزا و کارامە و پسپۆڕ لەکاروباری ئابووریدا .

abûrîzanay
ئابووریزانای :
بڕ. ئابووریزانی .

abûrîzane
ئابووریزانە :
بڕ. ئابووریزان ( بۆ مێ ) .

abûrîzanî
ئابووریزانی :
زانستێکە شێوەی بەڕێوەبردنی دارایی و داهاتی وڵات و خێزان و ناوماڵ ڕێکدەخات و بەڕێوەیدەبات و لە چۆنیەتیی پەرەسەندنی دەکۆڵێتەوە .

abûrînas
ئابووریناس :
بڕ. ئابووریزان .

abûrînasay
ئابووریناسای :
بڕ. ئابووریزانی .

abûrînase
ئابووریناسە :
بڕ. ئابووریزان ( بۆ مێ ).

abûrînasî
ئابووریناسی :
بڕ. ئابووریزانی

abûne
ئابوونە :
١-پارەتیی تەرخانکراو بۆ مزگەوت ، مەلا ، فەقێ ، مجەور و هەژاران.
٢- پارەی بەشداربوون لە ڕۆژنامەو گۆڤاردا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو .
٣-مانگانە ،یان ساڵانەی ئەندامێتی لە پارت و ڕێکخراوەکاندا .

abûnedan
ئابوونەدان :
دانی پارەی ئابوونە .

abûneday
ئابوونەدای :
بڕ. ئابوونە دان .

abide
١-ئابیدە :
١-شوێنی نوێژکردن و خوا پەرەستن.
٢-شوێنی پیرۆزی ئایینی .
٣-شێوە و ڕوخساری داتاشراو هەڵکەندراوی گیاندار لەسەر دار و بەرد و گڵێنە ، یان داڕێژراو لە هەندێك کانزا و مڕادی تر
٤-ئەو پەیکەر و تاشراو و وێنانەی هەندێ لە خەڵك و گەلان دەیانپەرستن.

ئابی زیندەگانی : abîzîndeganî

بڕ. ئاوی حەیات .

ئاگـــەه بـــــڕژن ژ ئـــــاسمانی

سەرچەشمەیی ئابی زیندەگانی (ئەحمەدی خانی)

ئابێ : abê

بڕ. ئەلفبێ

ئاپ : ap

برای باوك .

ئاپا : apa

خوشکی دایك ، یان باوك .

ئاپارتی: apartî

١-کەسێك کە لە ئاستی هەموو کردەوەیەکی ئەنگدا، بێدەربەست و بێپەروابێ .

٢-کەسێك کە داوای پێویستی و خواردن و شت بکات و شەرمنەکات.

٣-کەسێك کە هەڵپە بکات بۆ خواردنی بەلاش ( مشەخۆری بەهەڵپە ) .

٤-کەسێك کە دەمی پیسبێ و شەڕە جنێو بکات .

٥-کەسێك کە ڕێز لە خۆی گەورە تر و دەوروبەری نەگرێت و بێپەروا لەڕوویاندا هەڵبگەڕێتەوە .

١-ئاپتەر : apter

بڕ. ئیبلیس .

٢- ئاپتەر : apter

کەسێك کە خانەکانی مێشکی تێکچووبن و ئاوەزو هۆشی نەمابن ( شێت ) .

٣- ئاپتەر : apter

بڕ٢-ئابیدە

ئاپتەر بوون : apterbûn

نەمانی ئەقڵ و بیروهۆش و ئاوەز . ( شێتبوون ) .

ئاپتەرگە : apterge

شوێن و خەستەخانەی تایبەتی کە شتیی تێدا کۆدەکرێنەوە بە نیازی چارەسەرکردنیان . ( شێتخانە ) .

ئاپتەری : apterî

چۆنێتیی وتە و کارو کردەوە و هەڵسوکەوتی پڕ لە فێڵ و تەڵەکە بازی.

بارودۆخی کەسێك کە خانەکانی مێشکی تێکچووبن و ئاوەزو و هۆشی نەمابن . ( شێتی ) .

١-ئاپتەریکردن : apterîkirdin

هەڵسوکەوت و ڕەفتارکردنی پڕ لە فێڵ و تەڵەکەبازی و ئەنجامدانی کاری ناڕەوا و خەڵەتاندن .

٢- ئاپتەریکردن : apterîkirdin

دووزمانیکردن و بۆ تێچاندن بە نیازی زیان پێگەیاندن .

ئاپرەخ : aprex

جۆرە خواردنێکە : برنج و داو دەرمان و قیمە و شتی تری پێویستی تێکەڵدەکرێ ، بە سلق ، یان گەڵا مێوو ... هتد دەپێچرێتەوە زۆرجار ئەم ئاوێتەیە دەکرێتە ناو کوولەکە ، باینجان ، پەتاتە و پیازەوە و دەکوڵێندرێ . ( یاپراخ ).

ئاپرژێن : apirjên

بڕ. ئاوڕشێن

ئاپرژێنکردن : apirjênkirdi

بڕ. ئاوڕشێنکردن

ئاپزا : apza

بڕ. ئامۆزا .

ئاپك : apik

بچکووککراوەی (( ئاپ ))

ئاپگینە : apgîne

بڕ. ئاوێنە

ئاپۆ : apo

١-بڕ.ئاپ .

٢-بۆ بانگکردنی مام و پیاوی بە ساڵاچوو بەکاردێت .

٣-بانگکردنی پیاو بەڕێزەوە .

ئاپۆژن : apojin

بڕ. ئامۆژن .

١-ئاپۆر : apor

بڕ. ئاپوورە .

٢- ئاپۆر : apor

چورت و لێقەومانی سەخت و ئالۆز کە ڕزگار بوون لێیان دژوار بێ .

٣- ئاپۆر : apor

بڕ. ئاوارە .

١-ئاپۆرە : apore

بڕ. ئاپوورە .

٢- ئاپۆرە : apore

بڕ. ئامار .

٣- ئاپۆرە : apore

خەم و پەژارە و گریان و کۆتەڵ لە ئەنجامی مردنی کەسێکی خۆشەویستدا .

١-ئاپۆرەکردن : aporekirdin

بڕ. ئامارکردن .

aporekirdin

٢- ئاپۆرەكردن :

كۆتەڵ و شین و شەپۆركردن لە ئەنجامی مردنی كەسێكی خۆشەویستدا .

aporekirdin

٣- ئاپۆرەكردن :

كۆبوونەوەی خەڵك لە شوێنێكدا .

aporhaÎ

ئاپۆرهاڵ :

كەسێكی كەمدەرامەت و هەژار و دەستكورت .

apû

١-ئاپوو :

باڵندەیەكی گۆشتخۆرە ، دووچاوی خڕو زەقی لە پێشەوە هەن ، زۆرتر لەشەودا دەردەكەوێت ، هێرش دەبات و ڕاو دەكات ، بەباڵندەیەكی شووم ناسراوە كوندە بەبوو .

apû

٢- ئاپوو :

مرۆڤی چارەگران و بەدقدوم و ناشیرین .

apûre

١-ئاپوورە :

١-كۆمەڵێ مرۆڤ و گیاندار ، كە دەورەیان لە مرۆڤ ، گیاندار و شت ، یان شوێنێك دابێت.

٢-كۆبوونەوە و خولخواردنی كۆمەڵێ هەنگ لە دەرەوەی پوورەی هەنگ ، بە دەوری شاژنی هەنگدا

apûre

٢- ئاپوورە :

خانە و پوورەی هەنگ .

apûrebestin

ئاپوورە بەستن :

كۆبوونەوە و كۆمەڵە بەستنی مرۆڤ و گیاندار بە دەوراندەوری مرۆڤ و گیاندار ، یان شوێنێكدا .

apûredan

ئاپوورە دان :

بڕ. ئاپوورە بەستن .

apêk

ئاپێك :

بڕ. ئیبلیس .

atac

١-ئاتاج :

مرۆڤ و گیانداری داما و بۆ یاریدە و كۆمەك .

atac

٢- ئاتاج :

پێڵاوی ژنان .

atacbûn

ئاتاجبوون :

دامان و پێویستبوونی مرۆڤ و گیاندار بە یاریدەر و كۆمەك .

atacî

ئاتاجی :

پێویستیی مرۆڤ و گیاندار بەكۆمەك و یارمەتی.

ate

١-ئاتە :

بچووككراوەی ناوی ئافتاو، یان فاتمە، یان خاتوونە بۆ خۆشەویستی .

ate

٢- ئاتە :

بڕ. نە نەوەتا .

ater
ئاتەر :
بڕ. ئاگر .
ateran
ئاتەران :
قسەکردن بەدەم خەوەوە ، یان لە ئەنجامی تا بردن و نەخۆشیدا ( وڕێنە ) .
ateş
ئاتەش :
بڕ. ئاگر .
ateşawî
ئاتەشاوی :
١-بڕ. ئاگراوی .
٢-بڕ. ئاتەشدار .
ateşe
ئاتەشە :
بڕ. ئاتەشەك .
ateşedar
ئاتەشەدار :
مرۆڤێك کە تووشی ئاتەشەك بووبێ .
ateşek
ئاتەشەك :
نەخۆشییەکی سێکسیی درم و پەرەسێنە ، لە ئەنجامی جووتبوونی نێر و مێی ئادەمیزادا کە یەکێکیان تووشی بووبێ ، پەیدا دەبێ . لەڕێگەی دایکیشەوە . ئاولەمە دەیگرێت .
ateşbarîn
ئاتەشبارین :
بڕ. ئاگر بارین .
ateşbazîkerdey
ئاتە شبازیکەردەی :
بڕ. ئاتەشبازیکردن .
ateşbazîkirdin
ئاتەشبازیکردن :
١-یاریکردن بە ئاگر .
٢-خۆهەڵقورتاندن لە گێرمە و کێشەی پڕ لە مەترسی و دەردیسەری .
ateşbeyar
ئاتەشبەیار :
بڕ. ئاتەشبیار .
ateşbiyar
ئاتەشبیار :
یارییەکە چەند کەسێ دەیکەن، وەستا و شاگردی تێدایە ، ئەوانی دی هێرشدەبەنە سەر شاگردێك ، بۆ ئەوەی لێیدەن، ئەگەر نەگیرا خۆی دەداتە پاڵ وەستا .
ateşpa
ئاتەشپا :
١-مرۆڤ و گیانداری خێرا و گورجوگۆڵ لە ڕۆیشتن و ڕەودا .
٢-پەلە و خێرایی و جموجووڵ و جرتوفرتی زۆر.
ateşpare
ئاتەشپارە :
بڕ. ئاگر پارە .

ئاتەشپەرست : ateşperist

بڕ. ئاگر پەرست .

ئاتەشپەرستی : ateşperistî

بڕ. ئاگر پەرستی .

ئاتەشبەنجە : ateşpence

١-مرۆڤی خاوەن بەهرەو دەست و پەنجە ڕەنگین .

٢-مرۆڤی بە تواناو گورجوگۆڵ لە ئیش و کارێکدا کە بە دەست و پەنجە ئەنجامبدرێت .

ئاتەشچەرخان : ateşçerxan

قوتوویەکی کونکونە ، ئاگر و خەڵووز و چیلکەی تێدەکرێت ، تەل ، یان پەتێك ، یان زنجیرێکی پێوە دەبەسترێت ، لە شەودا منداڵان هەڵیدەسووڕێنن ، پزیسك دەهاوێت .

ئاتەشخان : ateşxan

بڕ. ئاتوون .

ئاتەشخانە : ateşxane

١-بڕ. ئاتوون .

٢-شوێنی ئاگری سەماوەر .

٣-بڕ. ئاتەشگا .

ئاتەشریز : ateşrîz

ئامرازێکە لە کانزا دروستدەکرێ بۆ جیاکردنەوەی ئاگر لە خۆڵە مێش .

ئاتەشکێش : ateşkêş

خاکەنازێکی بچکۆلەی دەمچەماوەیە بۆ تێکدان و دەرهێنانی سکڵ لە تەندردان و سۆپای دار ...هتد .

ئاتەشگا : ateşga

بڕ. ئاتەشگە .

ئاتەشگە : ateşge

١-بڕ. ئاگردان .

٢-شوێنێکی بەرز کە ئاگری نەورۆزی لە سەردەکرێتەوە .

٣-جێگا و شوێنی ئاگرکردنەوە لە پەرستگەکانی زەردەشتییەکاندا .

ئاتەشگەردان : ateşgerdan

بڕ ئاتەشچەرخان .

ئاتەشی : ateşî

ڕەنگی سووری گەش و ئاگرین .

٢-جۆرە گوڵەباخێکی سووری گەشی کەمبۆنە.

٣- چلۆنایەتی و سیفەتی مرۆڤی تووڕە .

٤-کەسێکی شەڕەنگێز .

٥- مرۆڤی بەئالۆش کە هەمیشە حەزی لە جووتبوون و ڕابواردن بێ .

ئاتەشیدار : ateşîdar
بڕ.ئاتەشەدار .

١-ئاتەشین : ateşîn
بڕ.ئاگرین .

٢-ئاتەشین : ateşîn
بڕ. ئاگرین .

١-ئاتەگ : ateg
١- داوێن و چاکی کەواو کورتەك ..هتد
٢-دامێنی شاخ و کێو .
٣-ژێر کراسی ژنان .

ئاتەڵوێڵوتەڵ : ateluoteÎ
بڕ. ئاڵوگۆڕکردن .

ئاتەڵوێڵوتەڵکەر : ateÎuoteÎker
کەسێکە کاری ئاڵوگۆڕکردن بکات .

ئاتەڵوێڵوتەڵکراو : ateÎuoteÎkiraw
بڕ.ئاڵوگۆڕکراو

ئاتەڵوێڵوتەڵکردن : ateÎuoteÎkirdin
بڕ.ئاڵوگۆڕکردن .

ئاتەڵوێڵوتەڵکریا : ateÎuoteÎkirya
بڕ.ئاڵوگۆڕکراو .

ئاتەڵوێڵوتەڵکریاگ : ateÎûoteÎkiryag
بڕ.ئاڵوگۆڕکراو .

ئاتەڵوێڵوتەڵکریاو : ateÎûoteÎkiryaw
بڕ.ئاڵوگۆڕکراو .

ئاتەڵوواتەڵ : ateÎowateÎ
ئاتەڵوواتەڵ

ئاتەڵوواتەڵکەر : ateÎowateÎker
بڕ.ئاتەڵو ڵوتەڵکەر .

ئاتەڵوواتەڵکراو : ateÎuwateÎkiraw
بڕ.ئاڵوگۆڕکراو .

ئاتەڵو واتەڵکریا : ateÎuwateÎkirya
بڕ.ئاڵوگۆڕکراو .

ئاتەڵو واتەڵکریاگ : ateÎuwateÎkirya
بڕ.ئاڵوگۆڕکراو .

ateÎoweteÎ | ئاتەنوومتەڵ :
بڕ. ئاڵوگۆڕ .

ateÎuweteÎkiry | ئاتەنوومتەڵکریا :
بڕ. ئاڵوگۆڕکراو .

ateÎuweteÎkiryag | ئاتەنوومتەڵکریاگ :
بڕ. ئاڵوگۆڕکراو .

ateÎuweteÎkiryaw | ئاتەنوومتەڵکریاو :
بڕ. ئاڵوگۆڕکراو .

atir | ئاتر :
بڕ. ئاگر .

atirewan | ئاترەوان :
بڕ. ئاگرخۆشکەرە -١

atirxan | ئاترخان :
بڕ. ئاگرخان

atiropatîn | ئاترۆپاتین :
ناوی کۆنی ئازەربایجانی ڕۆژئاواو کوردستانی بەشی موکریان .

atroz | ئاتروز :
بڕ. ئاترۆس .

atrozî | ئاترۆزی :
بڕ. ئاترۆسی .

atros | ئاترۆس :
کەسێک کە بڕوای بە بوونی یەزدان و هیچ بیروباوەڕێکی ئایینی نەبێت .

atrosî | ئاترۆسی :
بێبڕوایی بە یەزدان و هەموو بیروباوەڕێکی ئایینی

atÎay | ئاتڵای :
ماوە و دەرفەت بۆ ئەنجامدانی کارێك لە کاتێکی تردا .

atmece | ئاتمەجە :
درندە ، کە خۆی مڵاسدابێت و لە پڕ پەلاماری نێچیر بدات.

atû eyaÎ | ئاتوو ئەیاڵ :
ماڵ و منداڵ و ئەندامانی خێزان .

atûn | ١-ئاتوون :
١-بۆشایی ژێر گەرما و بۆ ئاگرکردنەوە و گەرمکردن ( توون ) .
٢- ئەو شوێنەی کە لە ڕۆژی پەسلاندا مرۆڤی گوناهکاری تێدەخرێت و سزا دەدرێت و دەسووسێنرێت ( دۆزەخ ) .

٢-ئاتوون : atûn

وشەیەکە بۆ ڕێزلێنان ، بە ئافرەت دەوترێت. ( خاتوون ).

ئاتی : atî

بڕ.ئاڵتوون .

ئاتیوانن : atîwanin

تواندنەوەی هەندێ شت و خواردەمەنی وەك ڕۆن و کەرە ... هتد .

١-ئاج : ac

١-بەسەرهات و ڕووداوی بەکەڵك.

٢-هەل و دەرفەتی لە بار و ڕەخساو بۆ ئەنجامدانی کارێك .

٢-ئاج : ac

ددانە و گرنج گرنجی بڕ بەند .

ئاجاخ : acax

بڕ.ئاشکرا :

ئاجاڕ : acař

بێخ و ڕیشکی گیا .

ئاجان : acan

بڕ ئاژان .

ئاجەڕات : aceřat

باوك و باپیرانی باوك

ئاجگ : acig

مرۆڤی پووڵپەرست و چاوچنۆك و دەستنووقاو ، کە لەدەمی خۆی و ماڵ و منداڵی دەگرێتەوە و هیچکەسێ کەڵکی لێنابینێ .

( پیسکە ) .

ئاجگی : acigî

پووڵپەرستی و چاوچنۆکی و دەستنووقاوی و دەسگرتن بە دارایی و سامانەوە . بە جۆرێکی وا کە کەس کەڵکی لێنەبینێ .

( پیسکەیی ).

ئاجووج و ماجووج: acûcumacûc

١-دوو هۆزی زیانەڕۆبوون لە وڵاتی تورکمانستان

٢-لە چیرۆکی کۆنی کوردەواریدا کۆمەڵە مرۆڤێکی کورتە باڵای بێشومارن کە لە پێش ئاخر زەماندا پەیدا دەبن و جیهان داگیر دەکەن ، گوایە هەر کەسێ سەیریانبکا بە کافری دەمرێ.

ئاجورە : acure

بڕ.ئاجوڕ .

ئاجوڕ : acuř

١-خشتی کاڵی کڵدراو لە کوورەدا .

٢-خشتی تەنکی کڵدراو بۆ داپۆشینی سەربانی لێژ بۆ پاراستنی لە دڵۆپە کردن .

ئاجۆر : acor

بڕ. ئاجوڕ .

ئاجورفەرش : acurferiş

تەختانی ناو ژووری خانووبەرە ،کە بە خشتی سوورەوەکراو ، یان کاشی .... هتد ،دا پۆشرابێت .

ئاجوور : acûr

بڕ. ئاجوڕ-١ .

ئاجوور بێژ : acûrbêj

کەسێکە کە کاری سوورکردنەوە و کڵدانی خشت ئە نجامبدات .

ئاجووربێژی : acûrbêjî

کاروباری سوورکردنەوە و کڵدانی خشت .

ئاجوول : acûl

بڕ. ئاجیل .

ئاجێل : acêl

بادەم و بستە و نۆك ..هتد سوێرکراوی برژێنراو کە بۆ خواردن و تررووکاندن بەکاردێ .

ئاجیل : acîl

گوێزو و بادەم و مێوژ و.. هتد کە بە بۆنەی لەدایکبوونی منداڵی نێرینەوە دەبەخشرێنەوە . (گوێزەبانە ) .

ئاجیل و ماجیل : acîlumacîl

بڕ. ئاجوج و ماجووج .

ئاچار : açar

١-رووەکێکی لاسکدار و بالأبەرزە ، پۆپەکەی بە گوڵێکی زبری ریشوو ار ئۆتاییدێت ، کە پڕە لە دەنکە گەنم ، پێیدەڵێن گوڵە گەنم.

٢-بەری ئاچارە ، بە نرخترین و دێرینترین دانەوێڵەیە ، کە مرۆڤ پێی ژیاوە و پێی دەژی ، ورد و درێژکۆلە و زەردباوە ، دەهاردرێ و دەکرێ بە نان . (گەنم )

٢-ئاچار : açar

ئامرازێکە بۆ کردنەوەی قفڵ و کێلوون.. هتد بەکاردێت .

٣-ئاچار : açar

گوێرەکەی نێرە کە ساڵە وەختی تەواو کردبێ .

ئاچارۆکی : açarokî

ڕەنگ و ڕوخساری زەرد و لاواز و ژاکاو .

ئاچاگە : açage

بڕ. ئالەوێ .

١ -ئاچەر : açer

بڕ. ئاچار .

٢-ئاچەر : açer

ئامرازێکی کانزای دەسکدارە ، نووکەکەی تیژ و پان ، یان خڕوتیژە بۆ بەستن و کردنەوەی جەڕو بورغو بەکاردێت ( جەڕبادەر )

٣-ئاچەر : açer

ئامرازێکی بچووکی قوتوو ئاسایە ، لەکانزا ،یان لە شووشە و پلاستیك دروستدەکرێت ، نەوت و بەنزین ،یان غازی تێدەکرێت ، بەهۆی بەردە چەرخەوە دادەگیرسێت . ( چەرخ )

١-ئاچخ : açix

١-ڕەنگی کاڵ ( سووری ئاچخ ) .

٢-سەرکەوتن لە هەرکارێکدا .

٢- ئاچخ : açix

ڕێ ، دەرگا و هتد ... کراوە و نەگیرا و .

ئاچگ : açig

بڕ.ئاجك .

ئاچگی : açigî

بڕ.ئاجگی .

ئاچنە : açine

پارچە زەوییەکی بچووك .

ئاچوخ : açux

بڕ.ئاچخ .

ئاچوگە : açoge

بڕ.ئالەوێ .

ئاچیگە : açîge

بڕ.ئا نێرە .

ئاحر : aĥir

سمت و کەفەڵی ئەسپ و چارەوێ .

ئاحێل : aĥêl

مرۆڤی پیر و بەساڵاچوو .

١-ئاخ : ax

١-وشەیەکە بۆ دەربڕینی ئێش و ئازار.

٢-وشەیەکە بۆ دەربڕینی خەم و خەفەت و بێدەسەڵاتی ئاخ لەم دەورووزەمانە.

٣-وشەیەکە بۆ دەربڕینی لە کیسچوونی دەرفەت ، یان شتێکی بە نرخ

* ئاخ بۆ ڕۆژانی ڕابوردوو !

٤-وشەیەکەبۆ دەربڕینی ئاوا تخواستن

* ئاخ بۆ ژیانێکی پڕلە کامەرانی !

٢- ئاخ : ax

١-بەشی نەرمانی توێژاڵی سەرەوەی گۆی زەوی، ئاوێتەی چەندمژادێکە . بۆر ، ڕەش ، سووربـاو .. هتد ، کە توێژاڵی سەرەوەی زەوی لێدروستبووە .

٢-بەشی فشەڵۆك و نەرمانی ئاوەوە و قووڵایی زەوی .

٣-بەشی زۆر ورد و گەردیلەی سووکەڵە و توێژاڵی سەر ڕووی زەوی.

٤-بەشی وشکانی ڕووی گۆی زەوی .

ئاخایۆك : axayok

٥-ئەو خۆڵ و تۆز و گەردیلەوردانەی سەر ڕووی زەوی کە بەهۆی با ، باران ، گەسکدان و ... هتد ، لەزەوی بەرز دەبنەوە ، یان ڕادەماڵدرێن .

ئاخا : axa

بڕ. ئاغا .

ئاخاتی : axatî

بڕ. ئاغایەتی .

ئاخافتەر : axafter

بڕ. ئاخێوەر .

ئاخافتك : axaftik

خڵتەی ڕۆنی داخکراو .

ئاخافتگ: axaftig

بڕ. ئاخافتك .

ئاخافتن : axaftin

١-دەربڕینی وشە، یان ڕستەی واتـا دار لە نێوان دوو مرۆڤدا ، یان پتر .

٢- پرس و ڕاوێژپێکردن.

ئاخاڤتك : axavtik

چەند پیتێکی یەکگرتوو کە واتای شتێك دەبەخشن ...( وشە ).

ئاخاڤتن : axavtin

بڕ. ئاخافتن .

ئاخالەر : axaler

بڕ. ئاغالەر

ئاخاندن: axandin

بڕ. ئاخنین .

١-ئاخاوتن : axawtin

بڕ. ئاخافتن .

٢- ئاخاوتن : axawtin

سواربونی ولاخی بەرزە پاش ڕامکردن و ڕاهێنانی بۆ سواری.

ئاخایەتی : axayetî
بڕ.ئاغایەتی .
١-ئاخایۆك : axayok
کەسێکە کە خۆی بەزل دەزانێ و لە ڕاستیدا وانییە.
٢-ئاخایۆك : axayok
باڵندەیەکی بچووکی گۆشتخۆرە لەڕەگەزی واشەیە .
ئاخایی : axayî
بڕ.ئاغایەتی .
ئاخە : axe
بڕ.ئاغا .
١-ئاخەبان : axeban
گڵ و ڕژاکی بڵاوکراوە لەسەربان ، کە دەپەسترێتەوە و دەکوترێتەوە .
٢- ئاخەبان : axeban
دوو کەس ، یان پتر کە خەڵکی وڵاتێك ، ناوچەیەك ، یان شوێنێکبن . ( هاووڵاتی ) .
٣- ئاخەبان : axeban
١- چاوە خانوویەك .
٢-سەربانی گڵ ، کە تەخت و ڕێکبێت .
٤- ئاخەبان : axeban
قوماش ، شاڵ .. هتد کە پیرە مێردان لەسەری دەبەستن .
ئاخە بانوو : axebanû
بڕ.ئاغا بانوو
ئاخەبانی : axebanî
پێکەوە نیشتەجێ و هاوماڵی و هاوبەشیی ژیان لە شوێن و ناوچەیەکدا .
ئاخە پۆلك : axepolik
یاری بەخۆڵکردن ،( خۆڵە پەتانێ ).
ئاخەڕەش : axeřeş
کەسێکی زۆر هەژار کە هیچ لە ماڵیا نەبێت .
ئاخەفتەر : axefter
بڕ.ئاخێوەر .
ئاخەفتن : axeftin
بڕ.ئاخافتن.
ئاخەفتیار : axeftyar
بڕ.ئاخێوەر .

axelêwe
ئاخەلێوە :
بڕ. ئاخلیف .
axeyî
ئاخەیی :
بڕ.ئاغایەتی .
axbaran
ئاخباران :
هاتنە خوارەوە و بارینی خاکو خۆڵ لە ئەنجامی هەڵکردنی بای بەهێز و گەردەلوولدا .
axban
ئاخبان :
بڕ.١- ئاخەبان .
axperist
ئاخپەرست :
کەسێك کە پەیوەندیی گیانیی بەهێزی لەگەڵ زەویی کشتوکاڵدا هەیە و دڵسۆزانە سەرەو کاری و خزمەتییکات .
axperistî
ئاخپەرستی :
پەیوەندیی گیانیی بەهێز و دڵسۆزیی خزمەتگوزای بۆ
زەویی کشتوکاڵ .
axpol
ئاخپۆل :
قوڕی گیراوەی تێکەڵ بەکار بۆ قوڕکاری .
axpîn
١-ئاخپین :
خاکو خۆڵی کۆکراوە بە گەسك .
axpîn
٢- ئاخپین :
زەویو زاری پەینکراو .
axte
ئاختە :
بارگیرێکە بەکاردەهێنرێ بۆ باربردن و کاروباری کشتوکاڵ.
axtif
ئاختف :
تف و بەڵغەم کە لە سینەدا پەنگیخواردبێتەوە .
axçe
ئاخچە :
گەرد و تۆز و خۆڵی ورد .
axçebaş
ئاخچە باش :
گیایەکی بەهاری گەڵا وردە دەکرێتە نێو دۆکوڵییەوە .
axiçkonas
ئاخچکۆناس :
یارییەکی کوردەوارییە .
axçî buxçî
ئاخچی بوخچی :
یارییەکی منالآنە دایك و باوك منداڵ بەدانیشتنەوە دەکەنە کۆلیان و خۆیان دەچەمێننەوە ، ڕاستدەبنەوەو ئەڵێن ئاخچی بوخچی . یان منالآن دوو دوو هەردوو دەستی یەکتری دەگرن و جۆلانە بە یەکتری دەکەن و هەمان ڕستە دەڵێنەوە .

axdar

ئاخدار :

١-کەسێکە بەهەناسەی ساردەوە ئاخ هەڵدەکێشێ .

٢-کەسێکە کە لە ئەنجامی کۆستکەوتن و بەلای دڵتەزێندا خەم و پەژارە دایگرتبێ .

* ئاخ چراخ ، چ ئاخ ، ئاخ پەی ئاخداریٚ چوون من خاتر خار ، خەمبار ، داخداریٚ ( مەولەوی )

axdare

ئاخدارە :

بڕ. ( بۆ مێ ).

axdarî

ئاخداری :

خەفەتباری و ماتەمین لە ئەنجامی کۆستکەوتن و بەلای دڵتەزێندا .

axir

١-ئاخر :

هەرشتێك لە چاوهاوچەشنەکانی خۆیدا لە دوای هەمووانەوە بێت .

axir

٢-ئاخر :

١-وشەیەکە بۆ ئاگادارکردنەوە دەربڕینی بێزاری .

* ئاخر وامەکە .

٢-وشەیەکە بۆ سەر زەنشتکردن .

* ئاخر کەی ئەبێ بە پیاو ؟

٣-وشەیەکە بۆ هەڕەشە کردن .

* ئاخر ئەمەت لەبیر نەچێ !

٤-وشەی پاڕانەوەیە لە بێدەسەلاتیدا .

* ئاخر چیم کردووە وام لێدەکەن !..

٥-وشەیەکە بۆ سەلماندنی شتێك .

*ئاخر وانییە؟!

٦-وشەیەکە بۆ بەهێزکردنی خواستێك ، یان ، ڕووداوێك .

*ئا کتێبەکەم وێدەوە .

٧-بڕ. ئایا .

axir

٣- ئاخر :

پاشماوەی کەلاوەی داڕووخاو .

axir

٤- ئاخر :

١- وشەیەکە هۆی ئەنجامنەدانی کارێك نیشانبدات .

* ئاخر تۆ نەهاتی ، بۆیە من ڕۆیشتم !.

٢-وشەیەکە واتای سەرکێشی و ملنەدان دەگەیەنێت .

* ئاخر تۆ لێتدام بۆیە ئیشەکەم نەکرد .

٥- ئاخر : axir

بڕ. ئەنجام

وەخت بێ لێلاویت بگێرۆ چەمان .

تا ئاخر دووریت وست نەبەینمان . (مەولەوی)

ئاخرەت : axiret

١-ڕۆژی زیندوو بوونەوە و هەستانەوە لەو دنیا .

٢-سەرەنجام و چارەنووس .

* خوا ئەزانێ ئاخرەتمان بە چی دەگات ! .

٣-جیهانی دووای زیندو بوونەوە .

ئاخرەگی : axregî

بڕ. ئاخری .

ئاخرەم : axrem

بڕ. ئاخر .

ئاخرەمین : axremîn

بڕ.ئاخر .

ئاخر بوون: axirbûn

کۆتاییهاتنی جیهان و نەمانی ژیان لە سەرزەوی.

ئاخر خێر: axirxêr

کەسێکە کە ڕۆژگاری کۆتایی تەمەنی بەخۆشی و ئاسوودەیی و هێمنی بەسەربەرێت .

* دەك ڕۆڵە ، ئاخرت خێربێت !

ئاخر خێرە : axirxêre

بڕ. ئاخر خێر. ( بۆ مێ ) .

ئاخر خێری : axirxêrî

ڕۆژگاری کۆتایی تەمەن کە بە خۆشی و ئاسوودەیی ببرێتە سەر .

ئاخر زەمان : axirzeman

١-ئەو کاتەی ژیان لەسەر ڕووی زەوی کۆتاییدێت .

٢-سەردەمی ناخۆشی و پڕ لە مەینەتی ، کە هەریەکە هاواری خۆیەتی .

٣- پەرەسەندن و هێرشهێنانی ستەم و خراپەکاری لەچاو چاکە وخێرخوازییدا.

ئاخر سۆنگی : axirsongî

١-بڕ. ئەنجام .

٢-بڕ. ئاخری .

ئاخر شەڕ : axirşer

١-کەسێك لە کۆتایی ژیانیدا بەڵاو دەردیسەر ڕوویان تێکردبێ .

٢-کەسێك لە دوا دوایی ژیانیدا سەری لێبشێوێ و ڕێی خراپەکاری بگرێتە بەر .

ئاخرڤه : axirve

بڕ. ئاخری .

ئاخرکه : axirke

جۆره مێشووله‌یه‌کی ئێجگار ورده له‌گه‌ڵ شه‌وداهات به‌ر ئه‌بێته ویزه‌ی خه‌ڵك و گیانیان دێنێته خوروو . ( خاکو )

ئاخرکردن : axirkirdin

شت به قورسگرتن و هه‌راو هوریا نانه‌وه به‌شێوه‌یه‌کی ئاڵۆز که‌وا بزاندرێ ڕچه‌یه‌کی کێشه و گه‌وره‌یه و چاره‌سه‌ی نییه .

ئاخرمین : axirmîn

بڕ. ئاخر .

ئاخر و ئۆخر : axir u oxir

نزیکبوونه‌وه‌ی کۆتایی کارێك ، یان کاتێك

* له ئاخر و ئۆخری به‌هاردا هه‌وا گه‌رم ده‌بێت .

ئاخر هاتن : axirhatin

ته‌واو بوون و کۆتاییهاتنی هه‌رچی شتێك .

ئاخرهانین : axirhanîn

ته‌واوکردن و کۆتاییهێنان به هه‌ر کار و کرده‌وه‌یه‌ك.

ئاخر هه‌مین : axirhamîn

بڕ. ئاخر

ئاخر هه‌مینه : axirhemîne

بڕ. ئاخر. ( بۆ مێ ).

١-ئاخری : axirî

دواکات و کۆتایی ئه نجامی هه‌ر کارو به‌سه‌رهات و مه‌به‌ست و قسه‌یه‌ك .

*ئاخری کورد به‌ئاوات ده‌گات .

٢- ئاخری : axirî

بڕ. ئاخر.

٣- ئاخری : axirî

وشه‌ی گله‌یی و سه‌رزه‌نشته .

* ئاخری هه‌ربه قسه‌ت نه‌کردم .

ئاخرین : axirîn

بڕ. ئاخر .

ئاخرینه : axirîne

بڕ. ئاخرین . ( بۆ مێ ).

ئاخرییه‌که‌ی : axiriyekey

بڕ. ئاخری

axzûm ئاخزووم :

بڕ ئاوزوونه .

axzîm ئاخزیم :

بڕ. ئاو زوونه .

axisibat ئاخسبات :

نیوەی دووەمی مانگی شوبات .

axistan ئاخستان :

زەوییزاری بەکەڵك بۆ چاندن و کشتوکاڵ.

axiş ئاخش :

بڕ. ئۆخەیش

axiftin ١-ئاخفتن :

کولانەوە و دەمکردنەوەی برین و سارێژ نەبوونی .

axiftin ٢- ئاخفتن :

بڕ. ئاخافتن .

axvandin ئاخڤاندن :

دەرکردنی برین و دوومەڵ و پاککردنەوەیان لە خوێن و زووخ .

axvitker ئاخڤتکەر :

بڕ. ئاخێوەر .

axivtin ئاخڤتن :

بڕ. ئاخافتن .

*ئاخڤتن کارەکی مرۆڤایەتییە *

axkêş ئاخکێش :

بڕ. ئاخهەڵکێش .

axkêşan ئاخکێشان :

بڕ. ئاخهەڵکێشان .

axkîşe ئاخکیشە :

بڕ. ئاخهەڵکێش . (بۆ مێ ).

axkîştey ئاخکیشتەی :

بڕ. ئاخهەڵکێشان .

axge ئاخگە :

بڕ.١- ئاسانە .

axger ئاخگەر :

بڕ. ئاخگەرد .

ئاخگەرد : axgerd

خۆڵەمێشی تێکەڵ بە وردە پزیسکی ئاگر و پشکۆ ( ژیلەمۆ).

ئاخڵ : axiÎ

بڕ. ٥-ئاخلە -٢ .

ئاخلەری : axlerî

بڕ ئاغایەتی .

ئاخلیڤینک : axlîvînik

بڕ. ئاخلەوێک .

١-ئاخلێڤ : axlêv

ڕۆژانی سەرەتای بەهار .

٢- ئاخلێڤ : axlêv

زەویی پاراو .

٣- ئاخلێڤ : axlêv

ئاوی لە پڕی گەرما لە بەهاری زوودا کە ئەبێتە هۆی توانەوەی بەفر .

٤- ئاخلێڤ : axlêv

ئاستی بەرزیی ئاوی زێ و ڕووبار لەئە نجامی بارینی بارانی فرەدا .

٥- ئاخلێڤ : axlêv

درۆ و دەلەسە .

ئاخلێڤە : axlêve

بڕ. ئاخلێڤ .

١- ئاخڵ : axiÎ

بڕ. ٤-ئاخر

٢-ئاخڵ : axiÎ

بڕ. ئاخلە .

٣- ئاخڵ : axiÎ

داری بڕدراوی لەسەریەك هەڵچنراو .

٤-ئاخڵ : axÎ

بڕ. ئاغل .

١-ئاخلە : axÎe

ئەو ڕۆشناییەی لە شێوەی بازنەدا جار جار دەوری مانگی پڕ دەدات . ( خەرمانە ) .

٢-ئاخلە : axÎe

١-دیوارێکی بازەنەییە لە تۆپەڵە تەپاڵە دروستدەکرێ ، بەبالأی زەلامێك بەرزە ، بۆ تێدا پاراستنی تەپاڵە و پشقلی وشك و ... هتد .

٢-دیوارێکی داخراوە بۆ کۆکردنەوە و پاراستنی لەوەڕ .

axÎe
٣-ئاخلە :
قەف و خول و سووڕی مار بەدەوری خۆیدا کە لەکاتی ئەلقە ئەلقە ئەپێکێ .

axÎe
٤-ئاخلە :
چاوگە ژوورێکی سەرنەگیراوی نزمە ، بۆ چێشتلێنان و نانکردن .

axÎe
٥-ئاخلە :
١-شوێنی مەڕو مالآت کە دەورەکەی بە دیوارێکی نزم ، یان چە پەرگیرا بێت .
٢-شوێنی مۆلدانی ڕان لەدەشتوودەردا .

axÎe
٦-ئاخلە :
بڕ. ئاپوورە .

axÎe
٧- ئاخلە :
هەرشتێکی بڕ کە دەمێکی تیژی هەبێ .

axÎe
٨- ئاخلە :
لاشانی یەکسەر دابڕاوی تیژو ساف و دیوار ئاسای چیاو کەژوکێو .

axÎedan
١-ئاخلەدان :
پەیدا بوونی ئاخلە لە دەوری مانگدا .

axÎeda
٢- ئاخلەدان :
ئەلقە پێکان و ئەلقە دانی مار بە دەوری خۆیدا بە شێوەیەکی بازنەیی .

axÎedan
٣- ئاخلەدان :
بڕ. ئاپوورە دان .

axÎewêk
ئاخلەوێك :
دەفرێکی دەمپەلە بۆ سوورکرنەوەی هەندێ خواردەمەنیی تایبەت بە سوور کردنەوە . ( تاوە ).

axiÎdan
ئاخلدان :
بڕ.١- ئاخلەدان .

axmax
ئاخماخ :
کەسێکە کە ڕادەی ئاوەز و پەیبردنی بە ڕاست وٚ چەوتی کەمبێت و گەلێ جار قسەی هەلەق و مەلەق و بێڕێ و شوێن بکات .
( شێتۆکە ) .

axmaxt
ئاخماخت :
بڕ. ئاخماخ

axmaxtî
ئاخماختی :
بڕ. ئاخماخی .

axmaxî
ئاخماخی :
بارودۆخی کەسێکی ئاخماخ .

axin
ئاخن :
ڕیشەی چاوگی ( ئاخنین )ە لە دوای ئاوەوە دێت ، ئاوێك، یان ئاوەلناوێکی لێدروستدەکات وەك : ( ناو ئاخن ، ناواخن ) .

ئاخاندن : axandin

بڕ. ئاخنین .

ئاخناو : axnaw

بڕ. ئاخنراو .

ئاخنای : axnay

بڕ. ئاخنین .

ئاخنران : axinran

پەستان و باش داگیرانی جەواڵ ، هەمانە و تەلیس .... هتد لەهەرشوێنێك .

ئاخنای : axnay

بڕ. ئاخنین .

ئاخنەبا : axneba

دوا هەفتەی وەرزی زستان .

ئاخندراو : axindiraw

بڕ. ئاخزاو .

ئاخنراو : axinraw

تەلیس و جەواڵ و هتد ... کەشتیان تێپەستێنرابێت و پڕپڕ بووبن .

ئاخنیا: axinya

بڕ. ئاخنراو .

ئاخنیاگ : axinyag

بڕ. ئاخنرا و .

ئاخنیاو : axinyaw

بڕ. ئاخزا و .

ئاخنیەی : axinyeî

بڕ. ئاخنین .

ئاخنین : axinîn

١-تێپەستاوتن و پڕکردنی هەر شتێك وەك ڕەشكە ، هۆڕ ، هەمانە و خورج و هتد ....

٢-گرتنی کون و کەلەبەر بە پەڕۆ و هتد.

* ئەو کونە باش بئاخنە .

ئاخنینەوە : axnînewe

ئاخنینی پێستە و هەمانە و مەشکە بە پەنیر و ئاردەتوو و خورما و کونجی و ...هتد بۆ هەڵگرتن .

ئاخنیێ : axinyê

بڕ. ئاخنرا و . ( بۆ مێ و بۆ کۆ ).

ئاخنێن : axnên

بڕ. ئاخنین .

١-ئاخوا : axwa

بڕ. ئاخۆ .

٢- ئاخوا : axwa

بڕ. ئایا .

ئاخواندن : axwandin

١-فێربوونی وانەی زانست و زانیاریی گشتیی تایبەتی لە حوجرە و قوتابخانەداو ... هتد .

٢-دەنگ و ئاوازی مەل و باڵندە .

ئاخو ئۆف: axu of

١-وشەیەکە بۆ دەربڕینی خەم و پەژارە .

٢-وشەیەکە بۆ دەربڕینی مەیل و تاسە و ئارەزووی دیداری دڵداران .

ئاخوئەمان : axu eman

وشەیەکە بۆ هاوارکردن و هانا بردن و بە دەمەوە هاتن .

ئاخوەند : axwend

١-مرۆڤێك کە توانا و بەهرەی قسەکردنی ڕێکوپێکی هەبێ .

٢-کەسێك کە پیاوەتی و چاکەی لێبوەشێتەوە .

ئاخوەندی : axwendî

١-بەهرەداری و بەتوانایی لە قسەکردن و ڕێکوپێکدا .

٢- پیاوەتی چاکە و لێوەشاندنەوە.

ئاخوتك : axutik

بڕ. ئاخافتك

ئاخوداخ : axudax

بڕ. ئاخو ئۆف .

ئاخوداخکەردەی : axudaxkerdey

بڕ. ئاخوداخکردن .

ئاخو داخکرن : axudaxkirin

بڕ. ئاخوداخکردن .

ئاخو داخکردن : axudaxkirdin

سکاڵاکردن و دەربڕینی بێزاری .

ئاخودووخان : axudûxan

بڕ. ئاخ .

ئاخور : axur

بڕ. ئاخ .

ئاخوڕ : axuř

شوێنێکی هەڵبەستراوی . ئاوچاڵی درێژکۆڵەیە لەناو گەوڕ و تەوێلەدا ، یان دەرەوە بۆ ئالیکدانی چارەوێ و ئاژەڵ.

( ئاخوری چارەوێ بەرزە ، هێنی وردە ئاژەڵ نزمە ) .

ئاخوڕبەرز : axuřberiz

١-مرۆڤی لووتبەرز و خۆ بەزلزان .

٢-مرۆڤی زۆر خۆر کە هەمیشە بەدوای خواردنی مفتدا دەگەڕێ .

ئاخوڕچەور : axuřçewir

١-مرۆڤی ساماندار و خێرمو مەند .

٢-مرۆڤێك کە خواردنی باش دەرخواردی خۆی و ماڵ و مناڵ و میوانی دەدات .

ئاخوڕ خوار : axuřxiwar

مرۆڤێك کە کارو ڕەفتارو وتەی نارەوای لێبوەشێتەوە .

کەسێك بە شێوەیەکی جوان نان نەخوات .

ئاخورلێتێکچوو : axurlêtêkçû

کەسێکە کە خۆی لێگۆڕابێ و لە خۆی باییبوبێ .

ئاخورلێتێکچوون : axurlêtêkçûn

لەخۆگۆڕان و لەخۆ باییوون .

ئاخو کەسەر : axukeser

بڕ ئاهو ناڵە .

ئاخو ناڵە : axunaÎe

بڕ ئاهو ناڵە :

ئاخوند : axund

١- پیاوی ئایینیی شیعە .

٢-مرۆڤی خویندەوار .

٣-کەسێك کاری نووسین و پاراستنی نهێنیی کار و نووسینی کەسێك بکات .

ئاخۆ : axo

بڕ. ئایا .

ئاخۆتن : axotin

بڕ. ئاخافتن .

ئاخۆتنەڤە : axotineve

تەڕاییدان و هاتنە خوارەوەی ئاو لە کونۆچکەی قەڵبەز ، کێو ، کوندە ، مەشکە ، هتد ...

ئاخوون : axûn

بڕ. ئاخوند .

ئاخووند : axûnd

بڕ. ئاخوند .

ئاخویرك : axwîrik

بڕ.ئاخرکه .

ئاخوین : axwîn

١-سەیرکردن و چاوپێدا خشاندنی نووسراو ، ڕۆژنامە ، گۆڤار ، کتێب و هتد ... وتنەومیان بەدڵدا ، یان لەبەرخۆوە و تێگەیشتن لە ناوەڕۆکیان .

٢-گەیاندنی مەبەست و ناوەڕۆکی نووسراو بە گوێگران .

١-ئاخۆ : axo

ئامرازی پرسیارە بە گومان و سەرسوڕمانەوە .

*ئاخۆ بە ئاوات بگەین؟!

٢- ئاخۆ : axo

مژادێکی شلی خەست و زەردی سەوز باوە ، لە ئەنجامی پیسبوونی خوێن لە برینداپەیدا دەبێت ( کێم ) .

ئاخۆتن : axotin

بڕ. ئاخافتن .

ئاخۆران : axoran

١-بڕ. ئاخۆران و بخۆران .

٢-گۆڕین و هەڵگێڕانەوەی ڕژێمێکی فەرمانڕەوا لە ئەنجامی جموجووڵێکی سەربازی و لەشکریدا .

ئاخۆران و بخۆران : axoranubixoran

١- پاشا گەردانی لە کاروباردا .

٢-ئاژاوە و پشێوی لە ئەنجامی پەیڕە و نەکردنی یاسادا .

٣-نەپەرژاندنە سەر و فریاکەوتن و هەواڵپرسینی کەسێك .

ئاخۆرە : axore

مێروویەکی باڵداری ورد و بچکۆلە و زیانبەخشە زۆربەیان دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ، زۆرتر لە گۆم و زەلکاو دا گەرا دادەنێن .

ئاخۆم : axom

بڕ. ئاخۆ .

ئاخوو : axû

بڕ. ئاغوو .

ئاخوا : axwa

بڕ. ئاخۆ

ئاخواخ : axwax

پێکەنینی شێوە حیلکە حیلك و دزێو کە لە ئاخەوە هەڵدەقوڵێ .

ئاخوە وەند : axwewend

بڕ. ئاخوەند .

ئاخوور : axûr
بڕ. ٤ ئاخر .
ئاخهەڵکێش : axheÎkêş
کەسێکی خەمبار کە هەناسەی سارد و قووڵ هەڵکێشێت .
ئاخهەڵکێشان : axheÎkêşan
هەناسە هەڵکێشانی سارد و پڕ لە پەژارە.
ئاخهورکیش : axhurkîş
بڕ. ئاخهەڵکێش .
ئاخهورکیشای : axurkîşay
بر: ئاخهەڵکێشان .
ئاخهورکیشە : axuhurkîşe
بڕ. ئاخهەڵکێش .( بۆ مێ ).
ئاخهورکیشتەی : axhurkîştey
بڕ. ئاخهەڵکێشان .
١-ئاخی : axî
١-کەسێکە کە ملنەدات بە یاساو دابونەریتی پەیڕەوکراو و لێیان یاخیبێ.
٢-مرۆڤی ڕێگر کە بەهێزی چەك و زۆرو زۆرداری خەڵك ڕووتبکاتەوە .
٣-گیانلەبەرێك کە بوغراو سەرکەشیبێ و ملنەدا بۆ سواری و بار .
٢-ئاخی : axî
کەسێکە کە زۆر ئاخ هەڵنەکێشێ .
ئاخیابان : axyaban
ڕێو بانی ناو شار کەتێکەڵەو چەوی تێکرابێ و کوترابێتەوە ، زۆرجار قیرتاوکراوە و لەهەردوو کەناریشەوە شۆستەی تایبەتی هەیە بۆ پیادەڕە و ، دار و درەختیشی لێدەنێژرێت .
ئاخیاوان : axyawan
بڕ. ئاخیابان
ئاخیە : axya
سنگێکی ئاسن ، یان دارە ، لەبەردەم ئاخوڕدا دەکوترێت بۆ بەستنەوەی چارەوێ .. هتد
ئاخیبوون : axîbûn
ملنەدان بە یاسا و دابونەریتی پەیڕەوکراو.
ئاخیر : axîr
١-بڕ. ئاخوڕ .
٢-شوێنی حەوانەوە و تێدا ژیانی ئاژەڵ .
ئاخیزە : axîze
گەرمە ژانگرتنی مانگا بەر لە زایین بە ماوەیەکی کورت .

**ئاخین :** axîn

**هاوار و ناڵەکردن و گریان لە ئەنجامی ئازارو ئێشدا ، یان کەیلی و سۆزی دەروون .**

**ئاخینە :** axîne

**هەرشتێکی لە گڵ دروستکراو وەك گۆزە و جەرە و شتی لەو بابەتانە .**

**ئاخینداخین :** axîndaxîn

**بڕ. ئارەزوومەند**

**ئاخینوداخین :** axînudaxîn

**بڕ. ئاخهەڵکێشان .**

**ئاخینی :** axînî

**بڕ. ئاخینە .**

**١-ئاخێز :** axêz

**ڕێزلێنانی گەورەیەك لە کەسێك کە لە پلە و پایەدا لە خۆی خوارتربێ ، ئەویش بەکەمێك خۆبەرزکردنەوەی لە کاتی دانیشتندا .**

**بانوید شنەفت نەجاکەرد ئاخێز**

**بۆ ساپای سەریر ئەورەنگی پەروێز .**

**٢- ئاخێز :** axêz

**کۆچ وبنە و باری ئامادە و سازو پێچراوە .**

**٣- ئاخێز :** axêz

**هەستان و جووڵان و ڕابوون و پەلاماردان بە گورجی و بەتەکانەوە ( ڕا پەڕین ) .**

**٤- ئاخێز :** axêz

**کەسێك کە گورج و بەتەکانەوە هەستێ و پەلامار بدات و کارێك ڕا پەڕێنێ .**

**ئاخێزە :** axêze

**بڕ. ئاخێز . ( بۆ مێ ) .**

**ئاخێزکردن :** axêzkirdin

**کەمێك خۆ بەرزکردنەوە لەبەر کەسێك کە لە پلەو پایەدا خوارتربێ بۆ ڕێز پیشاندان لە کاتی دانیشتندا .**

**ئاخێز کەردەی :** axêzkerday

**بڕ. ئاخێزکردن .**

**ئاخێڤەر :** axêver

**بڕ. ئاخێوەر .**

**ئاخێنراو :** axênraw

**بڕ. ئاخنرا و.**

**ئاخێو :** axêw

**ڕەنگی چاوگی ئاخافتنە .**

ئاخێوەر : axêwer

کەسێکە کە دەدوێت .

ئاخێوتن : axêwtin

بڕ. ئاخافتن .

١-ئاد : ad

جێناوی تایبەتە بە کەسی سێیەمی تاکی نێر . ( ئەو ) بۆ نێرینەیە .

ئاد مـارو بەویر تەرزەکەی بـــالآت

نێد دیدەی مەستت ، ئەو خاڵی ئالآت (مەولەوی)

٢- ئاد : ad

بڕ. ١- ئادا .

٣- ئاد : ad

ئەو مەرج و وتەو نووسینانەیە کە لە نێوان دوو کەس ، یان زیاتر دا دەبەسترێت بۆ ئە نجامدان ، یان نەدانی هەر کارومە بەستێك . ( پە یمان ).

١-ئادا : ada

وشکانییەك لە هەموو لایەکەوە بە ئاو دەورە درابێ ( دوورگە ) .

٢- ئادا : ada

دایکی دایك ، یان باوکی باوك ( نەنك ) .

ئاداب : adab

کێم و پیسی و زووخی برین .

١-ئادار : adar

سێیەم مانگە لە ساڵنامەی گریگۆیدا کە سی ویەك ڕۆژە، دەکەوێتە نێوان شوبات و نیسانەوە .

*بەفری ئاداری بکەوێ تا گوێداری ، نامێنێ تا نێواری .

٢- ئادار : adar

بڕ. ئاسەوار

*ئاداری لەسەر یاداری نەماوە .

ئادارۆك : adarok

جۆرەگوڵێکی وردی کوێستانییە ، لە سەرەتای بەهار سەردەردێنێ ، قامکێك بەرز دەبێ ، بوخچە بوخچە زەرد و شین و مۆر و سپی ، دەنوێنێ پەلکەکانی شێوە بادەمی گر نجە ( گوڵە نەورۆز ).

ئاداش : adaş

دووکەس ، یان زیاتر کە هەمان ناویان هەبێ.

ئادان : adan

١-زەویی بە پیت و بەرپێژمن .

٢-کارومرۆڤی بەکەڵك .

٣-دارو درەختی بەردۆست و فرەبەر .

adanî

ئادانی :

١-بە پیتی فرە بەرهەمیی زەوی .

٢-کاری بەسوود و بە کەڵکی مرۆڤ .

٣-فراوانی و زۆریی بەروبووم .

ade

١-ئادە :

جیناوی تایبەتە بە کەسی سێیەمی تاکی مێ . (ئەو ) بۆ مێیینە .

ade

٢- ئادە :

جۆرە تەڵەیەکی دارە بۆ کەروێشکگرتن.

ade

٣- ئادە :

بژاری گیا و لابردنی لەنێو کشتوکاڵدا .

ade

٤- ئادە :

بڕ. ١- ئادا .

adebûn

ئادەبوون :

دابڕان و جیابوونەوەی دووکەس ، دوو شت ، یان دوو گیاندار .

ader

ئادەر :

مرۆڤ و گیاندار و شتی باش و ڕەسەن و بەکەڵك و سەربەتوخم و نەژادی باش و هەڵکەوتوو .

adeşa

ئادەشا :

بڕ. ئەوەیان . ( بۆ مێ ).

adekirdin

١-ئادەکردن :

١-بژارکردن و پاککردنەوە .

٢-هەڵپاچین و بڕینی و لقوپۆپی دارو درەخت .

adekirdin

٢- ئادەکردن :

جیاکردنەوە و لەیەکدابڕاندنی دوو کەس ، دوو شت یان دوو گیاندار .

adem

١-ئادەم :

یەکەم مرۆڤ کە خوا دروستیکرد ، لە کتێبە ئاسمانییەکاندا باسکراوە ، بابە گەورەی هەموو مرۆڤە .

adem

٢- ئادەم :

بڕ. ٢- ئاخ -١ .

adem

٣- ئادەم :

بڕ. ئادەمی .

قەط غیرەتە ئەی پەناهی عالەم

قەط لایقە ئەی شەبـــانێ ئادەم ( ئەحمەدی خانی )

ademza

ئادەمزا :

بڕ. ئادەمیزاد .

ئادەمزادە : ademzade

بڕ. ئادەمیزاد .

ئادەمك : ademik

دوو دار لە شێوەی خاچدا لەیەك دەبەسترێن پەڕۆ وپیتاڵیان پێوە دەپێچرێت لە شێوەی زەلام ، یان گیانداری ترسناك دەنوێنێت ، لەناو کشتوکاڵدا دادەنرێت بۆ ترساندن و تەرەکردنی باڵندە .( داهۆڵ ) .

ئادەمی : ademî

بڕ. ئادەمیزاد

ئادەمیزاد : ademîzad

١-ئافەریدەیەکە لەناو گیاندارانی سەر زەویدا ، لە هەمووان زیرەکترە وتوانای گفتوگۆ و دەربڕین و بەرهەمهێنانی هەیە .

٢-نەوەی ئادەم .

ئادەمیانە : ademyane

کاروکردەوە و پیشەی باش و مرۆڤانە .

ئادەمیگان : ademîgan

بڕ. ئادەمیزاد .

ئادەنە : adene

بڕ. ئاوێنە .

ئادەی : adey

وشەی هاندانە بۆ ڕاپەڕاندن و جێبەجێکردنی کارو مەبەستێك .

*ئادەی هەڵەتبەرن .

ئادر : adir

بڕ. ئاگر .

ئادشا : adşa

جێناوی تایبەتە بە کەسی سێیەمی تاك و نێر ، بەواتای ( ئەوەیان ) .

*ئادشاگرت .

ئادگار : adgar

١-شێوە و سەروسیمای مرۆڤ .

٢-ئەندازەی هەڵچوون و بەرزایی کەسێك کە بە پێوە بوەستێت ، هەر لە پێیەوە تا تەوقەسەری .

ئادنێ : adnê

یەکێکی دی ، بۆ مێ بەکاردێ

ئادوی : adwî

مێروو و جرِوجانەوەر و ئافەتی کشتوکاڵی کە دەبنە هۆی لەناو بردنی سەوزایی .

ئادۆنیس : Adonîs

خواوەندێکی ئەفسانەیی فینیقییە کۆنەکانە کە لەناو بردن و بوژاندنەوەی سروشتی بە دەستبووە ،بە پێی ئەفسانەکۆنەکان ئادۆنیس مردووە ، دوایی زیندوو بۆتەوە ، لە شێوەی لاوێکی شۆخدا پیشاندراوە کەگیرۆدەی داوی ئەفرۆدیت بووە .

ئادووده : adûde

١-دار ، یان قامیشی درێژ کە ئاسنێکی بچکۆڵەی بێڵەکان ئاسای پێوە بەندە . بنمیچی خانووی پێ پاکدەکرێتەوە .

٢-هەمان شت گەسکێك ، یان پارچە پەڕۆیەکی پێوە دەبەسترێت بۆ هەمان مەبەست .

١-ئادی : adî

١-بڕ. ئادنێ .

٢-وشەی پرسیارە بۆ ڕوونکردنەوەی هۆی ڕوودان ، یان ڕوونەدانی شتێك .

٢- ئادی : adî

خۆشەویستیی نزیکی وەك خزم و دۆستان .

٣- ئادی : adî

سۆز و بەزەیی دایکانە .

٤- ئادی : adî

ئەوانەی کە لە دایکەوە خزمایەتیان نزیکە .

٥- ئادی : adî

وەڵامە بۆ سەلماندنی پرسیارێك ( ئەدی ).

٦- ئادی : adî

بڕ . ئەوان .

ئادیچ : adîç

جێناوی تایبەتە بە کەسی سێیەمی تاکی نێر بەواتای ئەویش .

ئادیچە : adîçe

جێناوی تایبەتە بە کەسی سێیەمی تاکی مێ بەواتای ئەویش .

ئادیچی : adîçî

بڕ. ئەوانیش .

ئادیشا : adîşa

بڕ. ئەوانیان .

ئادێر : adêr

دەردووبەلا و سەخڵەتی .

ئادێنە : adêne

١-شوێن و زەوییەکە کە گژوگیای زۆر بێ و لەوەڕێ خۆشبێ.

٢-ماڵی پڕ لە ئازووخە کە لە هیچیان کەم نەبێ.

١-ئار : ar

بڕ. ئارد .

٢- ئار : ar

بڕ. ئاگر .

ar
٣- ئار :
پێوانەی ڕووبەرە ، بریتییە لە (١٠٠) مەتر دووجا.
ar
٤-ئار :
هەستی ناڕەحەتی دەروونیی کەسێك لە ئەنجامی کردنی کارێکی خراپەدا .
ar eremirkin
ئار ئەرمەرکن :
بڕ. ئاگر دامرکێن .
ar eremirkinay
ئار ئەرمەرکنای :
بڕ. ئاگر کوژاندنەوە .
ar eremirkine
ئار ئەرمەرکنە
بڕ. ئاگر دامرکێن . (بۆ مێ) .
ar eremirkîna
ئار ئەرمەرکینا :
بڕ. ئاگر دامرکێنراو .
ar eremirkinyê
ئار ئەرمەرکنیێ :
بڕ. ئاگردامرکێنراو ، ( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .
ar eremirkiya
ئار ئەرمەرکیا :
بڕ ئاگر دامرکاو .
ar eremirkiyay
ئارە ئەرمەرکیای :
بڕ. ئاگر کوژانەوە .
ar eremirkiyê
ئار ئەرمەرکیێ :
بڕ. ئاگر دامرکاو . ( بۆ مێ و کۆ) .
ara
١-ئارا :
دۆستایەتی و نێوا نخۆشی لەنێوان مرۆڤدا.
ara
٢- ئارا :
ئارەزوو لە خواردەمەنی و هەرشتێکی تر .
ara
٣- ئارا :
نێوان و مابەین دووریی دووشت لە یەکتر .
*باسی تۆ لەئارادا نییە .
ara
٤- ئارا :
جۆرە تووتییەکی کلکدرێژی بیکلاوی یەك ڕەنگە
ara
٥- ئارا :
چەقی گۆرەپان و شوێنانی تر .
ara
٦- ئارا :
جێگا و دەوروبەر .

ara ٧- ئارا :

بڕ. ئارایشتکراو .

ara ٨- ئارا :

پاشگرێکە دەلکێ بەناوەوە دەیکاتە بکەر.

*تاسولە یمانان نەچوونە ســەدری تەخـــتی ئەحمەدی موختاری ئێمە شاهی تەخت ئارا نەبوو ( نالی ) .

arac ئاراج :

بڕ. ئارج :

aras ئاراس :

بڕ. ئاراستە .

arase ئاراسە :

بڕ. ئاراستە

arasebûn ئاراسە بوون :

بڕ. ٧-ئارا.

arasekiraw ئاراسەکراو :

بڕ. ئاراستەکراو .

arasekirdin ئاراسەکردن :

بڕ. ئاراستەکردن .

arasekiryag ئاراسەکریاگ :

بڕ ئاراستکراو .

arasekiryaw ئاراسەکریاو :

بڕ. ئاراستەکراو .

arasekiryê ئاراسەکریێ :

بڕ. ئاراستەکراو ( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .

araste ١-ئاراستە :

ئامادە بۆ تێگرتن لەهەرشتێك پاش نیشانە لێگرتن .

araste ٢- ئاراستە :

بڕ. ئارایشکاو .

ئاراستە بـۆ عەروسخانە

دیوارو دەرو عروشێ خانە ( ئەحمەدی خانی )

araste ٣- ئاراستە :

بڕ. ئامادە .

araste ٤- ئاراستە :

بەرانبەر و ڕوو بەڕوو لە عاستی کەس و شوێن و شتێکدا .

arastebûn
١-ئاراسته بوون :
خۆجوانکردن و خۆڕازاندنەوە بە ماکیاژو پۆشینی پۆشاکی جوان و ئاڵوواڵا ئافرەت ئارانەبوو .

arastebûn
٢- ئاراسته بوون :
ڕوو بە ڕووبوونەوەو بەرامبەر وەستان لە عاستی مرۆڤ ، گیاندار ، شوێن و شتێکدا.

arastekerdey
ئاراسته کەردەی :
بڕ. ئاراسته کردن .

arastekirdin
١-ئاراستەکردن:
تێگرتن لەهەر شتێك پاش نیشانە لێگرتنەوەی .

arastekirdin
٢- ئاراستەکردن:
بڕ ئارایشتکردن .

arastekirdin
٣- ئاراستەکردن:
بڕ. ئامادەکردن .

arastekirdin
٤- ئاراستەکردن:
نیشاندانی ڕێگای کارێك بەکەسێك ، یان کۆمەڵێك .

arastekirdin
٥- ئاراستەکردن:
ڕووبەڕووکردنەوەو بەرامبەر وەستاندن لە عاستی مرۆڤ ، گیاندار ، شوێن و هەر شتێکدا .

arastekirdin
٦- ئاراستەکردن:
گەڕاندنەوەی کەسێك لەکار و شوێنێك لە دوای ناردنی .

arastekirdin
٧- ئاراستەکردن:
دووبارە ڕاسپاردنی کەسێك بە کارێك .

arastekiraw
١-ئاراسته کراو :
بڕ . ئاوێژراو -٢

arastekiraw
٢- ئاراسته کراو :
بڕ. ئارایشتکراو .

arastekiraw
٣- ئاراسته کراو :
بڕ. ئامادەکراو .

arastekiraw
٤- ئاراسته کراو :
کەسێك ، یان شتێك کە بەرەو ڕووی کەسێك کرابێتەوە.

arastekiraw
٥- ئاراسته کراو :
کەسێك، کارێك ، ڕێگایەك کە نیشاندرابن .

arastekirya
ئاراستەکریا :
بڕ. ئاراسته کراو .

arastekiryag
ئاراسته کریاگ :
بڕ. ئاراستەکراو .

ئاراستە كریاو : arastekiryaw

بڕ ئاراستە كراو .

ئاراستەكریێ : arastekiryê

بڕ. ئاراستەكراو ( بۆ مێ و بۆ كۆ ) .

ئاراستن : arastin

١-گوێنەدان بە كار و ڕەفتار و وتە و فەرمان و پشتگوێخستنی داواكاری .

٢-سستی نواندن لە كاروكردەوەدا.

ئاراڤ : arav

بڕ. ئاراو .

ئاراڤتن : aravtin

لەناو هەڵكێشانی پۆشاك بۆ ئەوەی لەكەفا و پاكبێتەوە .

١-ئاراق : araq

جۆرە ئامووڕێكە كە كەللە و باسكە و زمانەی لە دارێكی یەكپارچە دەتاشرێن و دروستدەكرێن .

٢- ئاراق : araq

ئامێرو كەلوپەلی كشتوكاڵ .

٣- ئاراق : araq

بڕ. ئارەق .

١-ئارام : aram

١-بێدەنگی و لەسەرخۆیی .

٢-توانای خۆگرتن و وبیندرێژی .

٣-توانای دامركاندنەوەی ڕق و تووڕەیی .

٤- پەلەنەكردن لە ئیش و كاردا .

٢-ئارام : aram

١-سیفەتی كەسێك ، یان گیاندارێك كە هێمن ولەسەر خۆبێ .

ئەڕۆ ئارامەن . ئەشەوخاوەمەن

چوون چەم گلكەران گلاراوەمەن ( مەولەوی )

٢-خۆڕاگر و بیندرێژ .

٣- پەلەنەكەر لەكار و هەڵسوكەوتدا .

ئارامە : arame

بر : ئارام . ( بۆ مێ ).

ئارامەندە : aramende

بڕ. ئارامگرتوو .

ئارامەندێ : aramendê

بڕ. ئارامگرتوو .( بۆ مێ وبۆ كۆ )

aramewker ئارامەوكەر :

بر. ئارامدەر .

aramewkere ئارامەوكەرە :

بر. ئارامدەر ( بۆ مێ ).

aramewkerdey ئارامە و كەردەی :

بر. ئارامكردنەوە .

arambexş ئارامبەخش :

بر: ئارامدەر -٢.

arambexşay ئارامبەخشای :

بر. ئارامبەخیشن .

arambexşe ئارامبەخشە :

بر.ئارامدەر ، ( بۆ مێ ) .

arambexşîn ئارامبەخشین :

دابەشكرن و بەخشین و پێدانی ئارامی بە مرۆڤ و گیاندار و دەروبەر .

arambiř ئارامبڕ :

كەسێك ، گیاندارێك ، شتێك كە ئارام لە مرۆڤ و گیاندار هەڵگرێ .

arambiře ئارامبڕە :

بر. ئارامبڕ .( بۆ مێ ).

arambiřan ئارامبڕان :

نەمانی ئارامی گیاندار .

arambiřaw ئارامبڕاو :

مرۆڤ و گیاندار كە ئارامیان نەمابێ .

arambiřya ئارامبڕیا :

بر. ئارامبڕاو .

arambiřyag ئارامبڕیاگ :

بر. ئارامبڕاو .

arambiřyaw ئارامبڕیاو :

بر. ئارامبڕاو .

arambiřîn ئارامبڕین :

نەهێشتنی ئارامی مرۆڤ و گیاندار .

arambiřyê ئارامبڕیێ :

بر. ئارامبڕاو . ( بۆ مێ ).

ئارامەوکەر : aramewker

بڕ. ئارامدەر .

ئارامەوکەرە : aramewkere

بڕ. ئارامدەر (بۆ مێ ).

ئارامە و کەردەی : aramewkerdey

بڕ. ئارامکردنەوە .

ئارامبەخش : arambexş

بڕ: ئارامدەر -٢.

ئارامبەخشای : arambexşay

بڕ. ئارامبەخیشن .

ئارامبەخشە : arambexşe

بڕ.ئارامدەر ، (بۆ مێ ) .

ئارامبەخشین : arambexşîn

دابەشکرن و بەخشین و پێدانی ئارامی بە مرۆڤ و گیاندار و دەروبەر .

ئارامبڕ : arambiř

کەسێك ، گیاندارێك ، شتێك کە ئارام لە مرۆڤ و گیاندار هەڵگرێ .

ئارامبڕە : arambiře

بڕ. ئارامبڕ .( بۆ مێ ).

ئارامبڕان : arambiřan

نەمانی ئارامی گیاندار .

ئارامبڕاو : arambiřaw

مرۆڤ و گیاندار کە ئارامیان نەمابێ .

ئارامبڕیا : arambiřya

بڕ. ئارامبڕاو .

ئارامبڕیاگ : arambiřyag

بڕ. ئارامبڕاو .

ئارامبڕیاو : arambiřyaw

بڕ. ئارامبڕاو .

ئارامبڕین : arambiřîn

نەهێشتنی ئارامی مرۆڤ و گیاندار .

ئارامبڕیێ : arambiřyê

بڕ. ئارامبڕاو . (بۆ مێ ).

agalêbûn

ئاگالێبوون :

١-چاودێریکردن و سەرپەرەشتیکردنی مرۆڤ ، گیاندار ، شت ، پاراستنیان لە مەترسی .

٢-سەرپەرشتی و پرسینەوە و بەسەرکردنەوەی لێقەوماوان

٣-زانینی هەواڵ و بەسەرهات و ڕووداو .

٤-بینینی ڕووداوی بەسەرهات .

: ئاگام لێبوو و دزەکە چووەماڵەکە ..

agalêhebûn

ئاگالێهەبوون :

بڕ ئاگالێبوون .

aganame

١-ئاگانامە :

هەر بانگەواز و ئاگادارییەك کە نیازبێ خەڵکی پێ ئاگادار بکرێت و مەبەستێك ڕابگەیەنرێت .

aganame

٢-ئاگانامە :

ئاگادارییەك بە نووسراو بگەیەنرێتە ئەو کەس و شوێنەی کە مەبەستە .

aganame

٣-ئاگانامە :

١- بڵاوکردنەوە بۆ دەرخستنی ئاگاداری .

٢-نووسراوی هەواڵناردن و ئاگادارکردن .

agawenebiyey

ئاگاوەنەبییەی :

بڕ ئاگالێبوون .

agah

ئاگاه :

بڕ ئاگا .

دنیەری سەرداری خویان ئەز نزام ئاگاه هـــەبە

حەبسی زێندانێ و ئەسیر و گرتی پێ دەرماندەبە؟ (جەزیری)

agahbûn

ئاگاهبوون :

١-بڕ ئاگاداربوون .

٢- بڕ ئەگابوون .

agahdar

ئاگاهدار :

بڕ ئاگادار.

agahdarî

ئاگاهداری :

بڕ ئاگاداری .

agahkirdin

ئاگاهکردن :

بڕ ئاگاکردن .

agahî

ئاگاهی :

بڕ ئاگاداری .

agayî

ئاگایی :

بڕ ئاگاداری .

ئاگە : age
بڕ. ئەویٚ
ئاگەدار : agedar
بڕ. ئاگادار .
ئاگەداربوون: agedarbûn
بڕ. ئاگاداربوون .
ئاگەدارکرن : agedarkirin
بڕ. ئاگادارکردن .
ئاگەدارکردنەوە : agedarkirdinewe
بڕ ئاگادار کردنەوە .
ئاگەداری : agedarî
بڕ. ئاگاداری .
ئاگەندە : agende
بڕ. ئاخنراو .
ئاگەندەی : agendey
بڕ. ئاخنین .
ئاگەه : ageh
بڕ . ئاگا .
من ئاگەه – های ژێ نینە . ( ئامیدی )
ئاگەهدار : agehdar
بڕ ئاگادار
ئاگەهداری : agehdarî
بڕ. ئاگاداری .
ئاگەهکرن : agehkirin
بڕ. ئاگاکردن .
ئاگەهی : agehî
بڕ ئاگاداری .
١-ئاگر : agir
١- پشکۆ و سکلی دار .
٢-کلپە و بلێسەی سووتەمەنی .
٣-ڤالازی گەرمبووی ڕووناك کە لە ئەنجامی سووتەمەنی پەیدا دەبێت* ( ئاگر بێ ئالاڤ نایە ) .
٢-ئاگر : agir
١- مرۆڤ و گیانلەبەری چالاك و گورجو گۆل .
٢-کەسێکی بە دەمو پل و وریا لە قسە و گفتوگۆدا.

٣-ئاگر : agir

ڕووناكیی هەندێك ئامێر وەكو چرا ، گڵۆپ و هتد.

٤-ئاگر : agir

چەك و تەقەمەنی .

٥-ئاگر : agir

١- نەخۆشی و پەتایەكە ، زۆرتر تووشی ئەسپ و كەر دەبێت ، سەرەتا تاو لەرزێكی گەرم دەیانگرێت، دەچەرێنن ، میز و پاشەڕۆیان دەبێتە خوێن ،زاڵەیان ڕەشدەبێتەوە و دەئاوسێت و دەبێتە هۆی كوشتنیان .

٢-نەخۆشییەكە تووشی مرۆڤ دەبێت ، پەڵە و لەكەی ئاڵۆشاوی دەردەدات ، دواى ئەوە ڕەش دادەگەڕێت و ئەڵقەی سوور بەدەوریدا پەیدا دەبێت . نەخۆش تا دایدەگرێت لەوانەشە بیكوژێت .

ئاگر ئاڤتین : agir avtîn

١-بڕ. ئاگركردنەوە

٢-بڕ. ئاگرتێبەردان -١

٣-تەقەكردن بە چەك

ئاگر ئاڤێژ : agir avêj

١-كەسێك كە ئاگر بكاتەوە .

٢-كەسێك بە چەك تەقە بكات .

٣-هەر ئامێر و شتێك كە تەقەمەنی بهاوێژێت .

٤-مرۆڤی شەڕ هەڵگیرسێن .

٥-بڕ. ئاژاوەچی .

ئاگر ئاوێژ : agir awêj

بڕ. ئاگر ئاڤێژ .

ئاگرئۆركردن : agir orkirdin

بڕ. ئاگركردنەوە-١

١-ئاگراوی : agrawî

مرۆڤی تووڕە و توندو زوو هەڵچوو .

٢-ئاگراوی : agrawî

بڕ. ئاژاوەگێڕ .

٣-ئاگراوی : agrawî

بڕ. ئاڵۆشاوی

٤-ئاگراوی : agrawî

بڕ. ئاگرین .

ئاگراوێژ : agrawêj

بڕ. ئاگر ئاڤێژ .

agrî
ئاگری :
نەخۆشییەکی پێستە ، تووشی دەوری دەموپلی منداڵ دەبێت ، وردە زیپکەی سوور و بە ئاڵۆش و زنجکاوی بە دەوری دەم و لێودا هەڵدەزنێت ، بە دەستلێدان و تەقاندن زیپکەکانی زوو تەشەنە دەکەن .

agre
١-ئاگرە :
تین و گڕەی گەرما .

agre
٢-ئاگرە :
نەخۆشییەکە ، لە ئەنجامی گڕەی بەهێزی گەرماوە تووشی کشتوکاڵ دەبێت و زەردیدەکات .

agrexore
ئاگرەخۆرە :
بڕ ئاگر خۆر .

agrexoşe
ئاگرەخۆشە :
١-ئاگرێکە گڕ و بلێسەی هەبێت و دووکەڵی نەبێت و جوان بسووتێت .
٢- پشکۆ و گڕ و بلێسەی بەتین .

agresûre
ئاگرە سوورە :
١-بڕ. ئاگرە خۆشە -٢
٢-بەڵای گەورەو گران .
: ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە .      پەندی پێشینان .

agreke
ئاگرەکە :
بڕ. ١- ئاگرە .

agrekewiÎ
ئاگرەکەوڵ :
بڕ. ئاگرتێپەربوون : ٣، ٥، ٦ .

agrekewÎbûn
ئاگرەکەوڵبوون :
بڕ. ئاگرتێپەربوون : ٣ ، ٥ ، ٦

agrekÎê
ئاگرەکلێ :
١-بڕ. ئاگرباری
٢-بڕ. ئێرە کلی

agreg
ئاگرەگ :
بڕ. ئاتەشەك .

agregiře
ئاگرەگرە :
ئاگرێك هەرگڕی هەبێت و پشکۆی لێنەکەوێتەوە ، وەك سووتاندنی نەوت ، بەنزین ، گاز ... هتد.

agremel
ئاگرەمەل :
بڕ. ئاگرە مەلووچ .

agremelûçik
ئاگرە مەلووچك :
بڕ. ئاگرە مەلووچ .

agrewan

ئاگرەوان :

بڕ. ئاگر خۆشکەر .

agrewker

ئاگرەوکەر :

١-کەسێك کە ئاگر بکاتەوە .

٢-بڕ. ئاژاوەگێڕ.

agrewkuş

ئاگرەوکوش :

بڕ. ئاگرتەمیرۆك .

agirbaran

ئاگرباران :

١-تەقە و گوللەی بێبڕانەوە و زۆر ، دەستدرێژکردنی چەند کەسێك پێکەوە .

٢-شەڕ و شۆڕ و ئاژاوە ، بگاتە ڕادەی بەکارهێنانی چەك .

٣-گەرمای زۆربەتین .

٤-ڕۆژگاری ناهەموار و ئاڵۆز و پڕ لە تەنگانە .

٥-بۆردومانکردن بەفرۆکە و تۆپ .

*ئەم ئاگربارانەدا چی بکەین !

agirbarane

ئاگربارانە :

بەستەیەکی ڕەسەن و کۆنی کوردەوارییە .

agirbarandin

ئاگرباراندن :

تەقەکردنی زۆر و بەردەوام و دابەراندنی گوللە و تەقەمەنی .

agirbarankirdin

ئاگربارانکردن :

تەقەکردن لە مرۆڤ ، گیاندار ، شت و شوێنێکی دیاریکراو

agirbaz

ئاگرباز :

کەسێکە کە یاری بە ئاگر بکات .

agirbazî

ئاگربازی :

١-گەمە و وازی بە ئاگر .

٢-تەقە و فیشەکە شێتەی هەڵدراو .

agirberek

ئاگر بەرەك :

زیپکەی ڕووی هەرزەکار کە هەندێ جار زیپکاوێکی لینجی لێدێت .

agirberbûnewe

ئاگر بەربوونەوە :

١-کەوتنەوەی ئاگر لە جێگایەکەوە بۆ جێیەکی دی .

٢-بەرپابوونی هەراو ئاشووب و ئاژاوە .

agirberdan

ئاگربەردان :

بڕ. ئاگرتێبەردان ١-٢، .

ئاگر بەردانەوە : agirberda[illegible]

١-سووتاندن و گڕپێوەنانی هەر شتێك

٢-هەڵنان و هاندانی مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی وتەوكاری زیانبەخش .

٣-بەرپاكردنی پشێوی و ئاژاوە .

ئاگربەست : agirbest

بڕ. ئاگربڕ.

ئاگربەستكەر : agirbestker

بڕ. ١، ٢ ، ٣ ئاگر بڕ.

ئاگربەستكەردەی : agirbestkerdey

بڕ. ئاگر بڕكردن .

ئاگر بەستكردن : agirbestkirdin

بڕ. ئاگر بڕكردن .

ئاگر بەستكراو : agirbestkiraw

بڕ. ئاگر بڕكراو .

ئاگر بەستكریاگ : agirbestkiryag

بڕ. ئاگر بەستكراو .

ئاگر بەستكریاو : agirbestkiryaw

بڕ. ئاگر بەستكراو .

ئاگر بردن : agirbirdin

١-خواستنی پشكۆی ئاگر بۆ ئاگر كردنەوە.

٢-بڕ ئاگر گرتن .

١-ئاگربڕ: agirbiř

١-كەسێك بەرهەڵستیی ئاگر بكات بۆ ئەوەی نەتەنێتەوە .

٢-بەربەستیی ئاگر بەخۆڵ ، ئاو ، گاز و ...هتد .

٣-كەسێك كە مرۆڤی گێرەشێوێن و بەدكار كپ و بێدەنگ بكات .

٤-كەسێك ناوبژیی نێوان خەڵك بكات ، بەنیازی دامركاندنەوەی شەڕ و ئاژاوە .

٢-ئاگربڕ: agirbiř

١- كەسێك كە بەرهەڵستیی ئاگر بكات بۆ ئەوەی نەتەنێتەوە.

٢-بەربەستی ئاگر بەخۆڵ ، ئاو ، گاز ...هتد .

٣-كەسێك كە گێرە شێوێن و بەدكار كپ و بێدەنگ بكات .

٤-كەسێك ناوبژیی نێوان خەڵك بكات بە نیازی دامركاندنەوەی شەڕ و ئاژاوە .

١-ئاگربڕكراو : agirbiřkiraw

ئاگرێك كە بەربەستكرا بێت و نەهێڵرابێت تەشەنە بكات .

agirbiřkiraw ۲-ئاگر بڕکراو :
ئاکۆکی و ئاژاوەیەك کە کوژێنرابێتەوە .
agirbiřkiraw ۳-ئاگر بڕکراو :
کارو ڕەوشت خووی نا پەسەندی ناو کۆمەڵ کە بەرهەڵستکرابن .
agirbiřkirya ئاگربڕکریا :
بڕ. ئاگر بڕکراو
agirbiřkiryag ئاگربڕکریاگ :
بڕ. ئاگر بڕکراو .
agirbiřkiryaw ئاگربڕکریاو :
بڕ. ئاگر بڕکراو .
agirbiřkirdin ئاگر بڕکردن :
۱-بەر بەستکردنی ئاگرێك کە کەوتبێتەوە.
۲-کوژاندنەوە و نەهێشتنی ئاژاوە و ئاکۆکیی نێوان خەڵك.
۳-بەرهەڵستکردنی کار و ڕەوشت و خووی نا پەسەند و نارەوای ناو کۆمەڵ .
٤-هێمنکردنەوەی مرۆڤ کە لە ئەنجامی کارو قسەی ناخۆشدا تووڕە بووبێت .
agırbotêberbûn ئاگربۆ تێبەربوون :
بەزمییهاتنەوە بە یەکێکدا کە باری ژیانی خراپ و دژوار بێت ، یان کارەساتێکی لێقەومابێت.
agırbûn ئاگر بوون :
۱-بڕ. ئاگر تێبەربوون .
۲-تەمەڵی و سستیکردن .
agirbûnewe ئاگر بوونەوە :
هەڵبوونەوە و پێبوونەوەی ئاگر پاش کوژاندنەوە و دامرکاندنەوەی .
agirpare ئاگر پارە :
۱-مرۆڤی زرنگ و چالاك .
۲-پشکۆ و پریشکی ئاگر .
۳-مرۆڤی شەڕانی و درو وەی وەکوڵ .
٤-سەلکەبزووت کە ئاگری پێوە مابێت .
agirparêz ئاگر پارێز :
۱-بڕ. ۱-ئاگر بڕ.
۲-بڕ. ئاگر پەرست .
agirparêzî ئاگر پارێزی :
بڕ. ئاگر پەرستی .
agirperes ئاگر پەرەس :
بڕ. ئاگر پەرست .

agirperestî
ئاگر پەرەستی :
بڕ. ئاگر پەرستی .
agirperesî
ئاگر پەرەسی :
بڕ. ئاگرپەرستی .
agirperest
ئاگر پەرەست :
بڕ. ئاگر پەرست .
agirperestin
ئاگرپەرەستن :
بڕ. ئاگرپەرستی .
agirperestî
ئاگر پەرەستی :
ئاگر بەخوا زانین و پەرەستنی .
agirpjên
ئاگر پژێن :
جۆرە بورکانێکە کانزاکانی بەشێوەی ئاگر دەپرژێن.
agirpêxistin
ئاگر پێخستن :
بڕ. ئاگرکرن ۱، ۲
agirpêketin
ئاگر پێکەتن :
بڕ. ئاگر تێبەربوون ۱ ، ۲
agirpêkirdin
ئاگرپێکردن :
داگیرساندنی ئاگر بە شخارتە و شاپلێتەو...هتد
agirpêkirdin
ئاگر پێکردن :
بڕ. ئاگر پێکرن .
agirpêgirtin
ئاگرپێگرتن :
۱-ئاگرکردنەوە بە شقارتە ، پشکۆ ، سەلکەبزوت چراوگ و٠٠ هتد .
۲-هاندان و ئاڵۆزکردنی مرۆڤ ، گیاندار ، بەڕادەیەك لەباری ئاسایی بچنەدەرەوە .
۳-هاندانی مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی کار و کردەوەی زیانەڕۆ .
agerpêwenan
ئاگر پێوەنان :
۱-بڕ. ئاگر پێگرتن .
۲-ئاگر تێبەردان .
۳-داخکردنی جەستە بە ئاگر .
٤-تەقەکردن لە مرۆڤ و گیاندار بەچەك .
agirtemîrok
ئاگر تەمیرۆك :
۱-کەسێکە کە کارو پیشەی ئاگر کوژاندنەوەیە .
۲-ئەو ئامێرانەی کە ئاگریان پێدەکوژێتەوە .
agirteyax
ئاگر تەیاخ :
هەر مژاد و شتێك کە بە ئاگر و لە ئاگردا نەسووتێت . ( دژە ئاگر ) .

agirteyaxî

ئاگر تەیاخی :

ئەسووتانی مژاد و هەر شتێك بە ئاگر و لە ئاگردا.

agertêberbû

ئاگر تێبەربوو :

١-منداڵی زۆر بزێو و زیانەڕۆ .

٢-کەسێکی سەربەگۆبەن .

٣-مرۆڤی وروژاو و بێئارام لە ئەنجامی تەزیندا بەکارەساتێك .

٤-ڕا پەڕیو دژی زۆردار و ستەمکار .

٥-کەسێك ، یان شتێك کە ئاگری تێبەربووبێت .

٦-کەسێك کە زۆر ئاڵۆشاوی بێت .

٧-ئۆقرە لێهەڵگیراو لە ئەنجامی نەخۆشیی قسەی خراپ و کاری توندو تیژ و هتد .

٨-کەسێك کە تاسە و ئارەزووی بە کوڵی هەستا بێت بۆ کەسێکی خۆشەویست .

٩-کەسێکی ئەسرەوتوو کەلە خۆڕا پەلاماری خەڵك بدات .

agirtêberbûn

ئاگر تێبەربوون :

١-ئاگرتێچوونی شتێك ، کەسێك ، گیاندارێك و ... هتد .

٢-زۆر تووڕە بوون و زۆر هەڵچوون .

٣-هەژان و بێئارامبوون لە ئەنجامی تەزیندا بەکارەساتێك .

٤-ڕا پەڕین دژی زۆر و ستەم .

٥-ئۆقرە لێهەڵگیران لە ئەنجامی نەخۆشی و قسەی خراپ و کاری توند و تیژ و ..هتد .

٦-جۆشهەستان و هێرشهێنانی ئاڵۆش بۆ جووتبوون .

agirtêberdan

ئاگرتێبەردان :

١-ئاگر نان بەشتێکەوە بە نیازی سووتاندنی .

٢-ڕقهەڵساندن و تووڕەکردنی کەسێك *( بەوقسانەی کردنی ئاگری تێبەردام ) .

٣-زیانپێگەیاندن .

٤-بوونە هۆی بەزەیی پێداهاتنەوە .

٥- بوونە هۆی هەستانی ئارەزوو بەهۆی لە نجە و لارو قسەی فێنك و جموجووڵی ئاڵۆشاوی و ... هتد .

agirtêberder

ئاگرتێبەردەر :

١-کەسێکە کە ئاگر بەرداتە کەسێك ، یان شتێك.

٢-کەسێکەکەهانی کەسانی تر، یان گیاندار دەدات و دەیانهەژێنێت .

٣-کەسێکە کە ئاژاوە بنێتەوە .

٤-کەسێکە کەبە لە نجە و قسەو ڕازونیاز و نواندنی جووڵانەوەی ئاڵۆشاوییەوە ئارەزوو هەڵدەستێنێت .

agirtêberdiraw

ئاگرتێبەردراو :

١-کەسێك ، یان شتێك کە گڕی لێهەستێ و بسووتێت .

٢-کەسێك ، یان گیاندارێك ، کەتووڕەکرابێت وهاندرابێ و هەڵچووبێت .

٣-کەسێك کە بەهۆی لە نجە و قسە و ڕاز و نیازەوە و پیشاندانی جووڵانەوەی ئاڵۆشاوییەوە ...هتد، ئارەزووی هەستێنرابێت

ـ ـد ـسـهردريا : agirtêberdirya

بر ـ ـكر تێبەردراو

ئاگرتیبەردریاگ : agirtêberdiryag

بڕ. ئاگرتێبەردراو .

ئاگرتێبەردریاو : agirtêberdiryaw

بڕ. ئاگرتێبەردراو .

ئاگرتێچوون : agirtêçûn

١-بڕ. ئاگرتێبەربوون .

٢-بەغیلیبردن بە مەبەستێك

ئاگر تێکەوتن : agirtêkewtin

١-بڕ ئاگرتێبەربوون .

٢-بڵاوبوونەوەی درم و نەخۆشی لە نێوان مەڕو ماڵ و کشتوکاڵدا .

ئاگرچوونەگیان : agirçûnegiyan

١-بڕ. ئاگرتیبەربوون .

٢-بڕ. ئاگر گرتن

ـاگرخان : agirxan

١-دروستکراوێکی کەوانە ئاسایە بۆ چێشتلێنان و گەرمکردنی ژوور و خانووبەرە بە سووتەمەنی .

٢ هەمان دروستکراو ، بەلام گەورە و فراوانترە ، بۆ لەواشە ، کولێرە ، سەموونکردن برژاندنی بەرهەم و نیشی هەویر .

٣-دامودەزگایەکە بۆ سوورکردنەوەو چەکوشکاریکردنی پۆلاّ و ئاسن و٠٠هتد بۆ دروستکردنی ئامێر وکەلوپەلی پێویست( کوورە )

ئاگرخانە : agirxane

بڕ. ئاگرخان .

ئاگرخوەش : agirxiweş

بڕ. ئاگرخۆش (-٣) .

ئاگرخۆرە : agirxore

١-مەلێکی ئەفسانەیی جوان و دەنگخۆشە، دەڵێن لەسەرمەرگدا پووش و پەلاّش کۆدەکاتەوە و لەسەریان باڵەتەپێ دەکات ولە ئەنجامی لێکدان و لێکخشاندنی باڵ وپووشەکەدا ئاگر دەکەوێتەوە وپووشەکە گڕ دەگرێت ودەیسووتێنێت ( قەقنەس )

٢-مریشکێکی گەورەیە ، دەڵێن ئاگر دەخوات .

ئاگر خۆش : agirxoş

١-مرۆڤی گاڵتەچی و قسە خۆش .

٢-کەسێك حەزی لەبەزم و ئاهەنگ و ڕابواردن بێت .

٣-مرۆڤی شۆخ و شەنگ .

٤-گەلێك کەلای خەڵك خۆشەویستبێت و بچێت بەدڵدا .

agirxoşbûn
ئاگرخۆشبوون :
١-گرسەندن و تاوسەندانی ئاگر و نەمانی دووکەڵەکەی .
٢- پەرەسەندن و گەرمبوونی هەرا و ئاژاوە و پشێوی و شەڕ.

agirxoşker
١-ئاگر خۆشکەر :
کەسێك کە سەرپەرشتی ئاگر بکات و نەهێڵێت دامرکێتەوە .

agirxoşker
٢-ئاگرخۆشکەر:
کەسێك کە ئاژاوە بخاتە ناو خەڵکەوە .

agirxoşkere
ئاگرخۆشکەرە:
بر. ئاگر خۆشکەر -٢ .

agirxoşkirdin
١-ئاگرخۆشکردن :
گەشاندنەوە و گڕسەندنی ئاگر باوەشێنکردن و فووڵێکردن و تێکدانی بە ئاگر کێش و مەقاش و ...هتد .

agirxoşkirdin
٢-ئاگر خۆشکردن :
..ەدان بۆ پەرەپێدانی ئاژاوە و ئاکۆکیی نێوان خەڵك

agirdaberdan
ئاگردابەردان :
١-هێرشکردنە سەر ، بەچەکەوە .
٢-ئاگرتێبەردان .
٣-تەقەلێکردن .

agirdadan
ئاگردادان :
١-بر. ئاگرناڤیتن .
٢-هەڵکردنی مەشخەڵ و چراوگ و شاپلیتە .

agirdagîrsan
ئاگرداگیرسان :
هەڵبوونی ئاگر .

agirdagîrsandin
ئاگر داگیرساندن :
بر. ئاگر پێگرتن .

agirdagîrsên
ئاگرداگیرسێن :
١-بر. ئاگرموکەر .

agirdagîrsêner
ئاگر داگیرسێنەر :
بر. ئاگرموکەر

agirdamirkan
ئاگردامرکان :
بر ئاگرکوژانەوە .

agirdamirkandin
ئاگردامرکاندن:
بر. ئاگرکوژاندنەوە .

agirdamirkandinewe
ئاگردامرکاندنەوە :
بر. ئاگرکوژاندنەوە .

١-ئاگردامرکاو : agirdamirkaw

کەسێکە کە ئاڵۆش و جۆش و خرۆشی شکا بێت

٢-ئاگردامرکاو : agirdamirkaw

کەسێکە کە هەڵچوون و قین و تووڕەیی نیشتبێتەوە.

ئاگردامرکیا : agirdamirkiya

بڕ. ئاگر دامرکاو .

ئاگردامرکیاگ : agirdamirkiyag

بڕ. ئاگر دامرکاو .

ئاگردامرکیاو: agirdamirkiyaw

بڕ. ئاگردامرکاو .

ئاگردامرکێن : agirdamirkên

١-بڕ. ئاگر تەمیرۆک .

٢-کەسێکە کە ئارەزوو و ئاڵۆشی گیان نەهێڵێت .

٣-کەسێك کە ئاژاوە و ئاشووب نەهێڵێت .

٤-ئاوی ساردو ساردەمەنی کەتینوویەتی بشکێنن و فێنکی بدەن بە لەش و دەروون.

ئاگردامرکێنەر : agirdamirkêner

بڕ. ئاگر دامر کێن .

ئاگردامرکێندراو : agirdamirkêndiraw

بڕ. ئاگر دامرکێنراو .

١-ئاگردامرکێنراو : agirdamirkêniraw

کەسێکە ئاڵۆشی و جۆش و خرۆشی شکێنرابێت .

٢-ئاگردامرکێنراو : agirdamirkêniraw

کەسێکە کە هەڵچوون و قین و تووڕەیی نەهێڵرابێت .

١-ئاگردان : agirdan

قوڵکەیەکە . زۆرتر لە تەختی ژووردایە ، ئاگری تێدا دەکرێتەوە .

٢-ئاگردان : agirdan

پێشکەشکردنی ئاگر بە کەسێك .

٣-ئاگردان : agirdan

بڕ. ئاگرڤێتن .

٤-ئاگردان : agirdan

دەرپەڕاندنی کەسێك لە شوێنێك بەگاڵتە پێکردنی و تانە و تەشەرلێدان .

٥-ئاگردان : agirdan

خۆشکردنی ئاگر .

agirdan

١- ئاگردان :

هەدانی خەڵك بۆ ئەنجامدانی قسە و مەبەست و كارێك .

agirdan

٢- ئاگردان :

بڕ ١- ئاگرتێبەردان .

agirdanik

ئاگردانك :

بڕ ١- ئاگردان

agirdaneber

ئاگردانەبەر :

بڕ ئاگر كرن

agirdanbîn

١-ئاگردانبین :

خێرا رۆیشتن .

agirdanbîn

٢-ئاگردانبین :

بڕ ئاگركرن .

agirder

ئاگردەر :

١-كەسێكە كە ئاگر دەدات بە كەسانی تر .

٢-بڕ. ئاگر خۆشكەر .

٣-ئامرازێكی خاكەناز ئاسایە بۆ تێوەردان و دەردانی ئاگر .

agirdijwar

ئاگردژوار :

بڕ ئاڵۆشاوی

agirdinavdaberdan

ئاگردناڤدابەردان :

بڕ. ئاگر تەمیرۆك .

agirserberdan

ئاگرسەربەردان :

بڕ. ئاگردابەردان .

agirserdaberdan

ئاگرسەردابەردان :

بڕ. ئاگردابەردان .

agirşewat

ئاگرشەوات :

هەرشتێك كە زوو گڕبگرێت و مەترسیی تەقینەوەی هەبێت

agirvedan

ئاگرڤەدان :

١-بڕ ئاگربەردانەوە .

٢-بڕ. ئاگركرن-٢

agirvesandin

ئاگرڤەساندن :

بڕ. ئاگركوژاندنەوە

agirvekuştin

ئاگرڤەكوشتن :

بڕ. ئاگركوژانەوە .

| | |
|---|---|
| ئاگرڤەمراندن : | agirvemirandin |
| بڕ. ئاگردامرکاندن . | |
| ئاگرڤیساندن : | agirvîsandin |
| بڕ. ئاگرکوژاندنەوە | |
| ئاگرڤێخستن : | agervêxistin |
| بڕ. ئاگرکرن ۱، ۲، ۳ | |
| ئاگرڤێس : | agirvês |
| بڕ. ئاگرتەمیرۆك . | |
| ئاگرکەتەدل : | agirketedil |
| گیرۆدەبوون بەداوی ئەڤین و دلداری . | |
| ئاگرکەوتنەگیان : | agirkewtinegiyan |
| ۱ـ بڕ. ئارام لێهەلگیران . | |
| ۲-تووڕەبوون و هەلچوون لە ئاستی قسە و کاروکردەوەیەکدا کە بە دلنەبن . | |
| ۳-ئارەزوو هەستانی بەتین و هێرش و زۆر بۆ هێنانی ئالۆش بۆ جووتبوون . | |
| ٤-جۆش و خرۆشهێنانی تاسە و ئارەزووی بەتین بۆ دلداری ئازدار و خۆشەویست . | |
| ئاگرکەوتنەماڵ : | agirkewtinemaÎ |
| ۱- گرتێبەربون و سووتاندنی ماڵ و خانووبەرە . | |
| ۲- پەیدابوونی هەراو ئاژاوە لەناوخێزاندا . | |
| ئاگرکەوتنەوە : | agirkewtinewe |
| ۱-بڕ. ئاگربەربوون . | |
| ۲-بەرپابوونی پەشێوی و ئاژاوە و شەڕ و شۆڕ . | |
| ئاگرکپکەر : | agirkipker |
| بڕ. ئاگرکوژێن . | |
| ئاگرکپکردن : | agirkipkirdin |
| بڕ. ئاگرکوژاندنەوە . | |
| ئاگرکپکردنەوە : | agirkipkirdinewe |
| بڕ. ئاگرکوژاندنەوە . | |
| ئاگرکراو : | agirkiraw |
| ۱-هەر شتێك کە لەسەر ئاگربێ و نەهێلرێت ئاگرەکەی دا بمرکێتەوە . | |
| ۲-مرۆڤ و گیانداری هاندراو و هەلنراو . | |
| ئاگرکردن : | agirkirdin |
| ۱-خۆشکردنی ئاگر بە پێوەنانی سووتەمەنیی تازە . | |
| ۲-بەرپاکردنی ئاژاوە . | |

ئاگرکردنەوە : agirkirdinewe

١-بڕ. ئاگرپێگرتن

٢-بڕ. ئاژاوەنانەوە .

ئاگرکرن : agirkirin

١- بڕ. ئاگرتێبەردان . ١، ٢

٢- داگیرساندنی چرا ، مۆم ، زۆپا ، و هتد ....

٢-کەڵەکەکردنی سووتەمەنی و ئاگرتێبەردان .

ئاگرکریاگ : agirkiryag

بڕ. ئاگرکراو .

ئاگرکریاو : agirkiryaw

بڕ. ئاگرکراو .

ئاگرکوتان : agirkutan

گەڕان بە دوای ئاگردا .

ئاگرکوژ : agirkuj

بڕ. ئاگرکوژێن .

ئاگرکوژانەوە : agirkujanawe

کزبوون و دامرکاندن و نەمانی ئاگر .

ئاگرکوژاندنەوە : agirkujandinewe

کپکردن و نەهێشتنی ئاگر بەهەر شێوە و شتێك

ئاگرکوژێن : agirkujên

١-کەسێکە کە ئاژاوە و ئاشووب ناهێڵێت و بەرهەڵستیاندەکات .

٢-بڕ. ئاگرتەمیرۆك .

ئاگرکوژێنەرەوە : agirkujênerewe

بڕ. ئاگرکوژێن .

ئاگرکوژێنەوە : agirkujênewe

بڕ. ئاگرکوژێن

ئاگرگا : agirga

بڕ. ئاتەشگا .

ئاگرگە : agirge

بڕ. ئاتەشگا .

ئاگرگەشاندنەوە : agirgeşandinewe

بڕ. ئاگر گەشکردنەوە .

ئاگرگەشەوکەر : agirgeşewker

بڕ. ئاگر گەشکەرە

ئاگرگەشکەرە : agirgeşkere

قووتویەکی کونکونی لەکانزا دروستکراو ، یان تەلێکی تەنراو . زریزەیەکی درێژی پێوە بەندە . خەڵووز و ئاگری تێدەکرێت و بە هەڵسووڕاندنی دەگەشێتەوە .

ئاگرگەشکەرەوە : agirgeşkerewe

ئاگر گەشکەرە .

ئاگرگەشکردنەوە : agirgeşkirdinewe

١-خۆشکردنی ئاگر بە باوەشێن ، فوولێکردن ... هتد .

٢-بەکارهێنانی ئاگر گەشکەرە بۆ ئاگر خۆشکردن

ئاگرگر : agirgir

شتێك کە ئاگری گرتبێت و بسووتێت .

ئاگرگرە : agirgire

١-دەستە چیلکە و پووش بۆکردنەوەی ئاگر.

٢-سکڵ و پشکۆ کە دەخرێتە بن پووش و پەلاش و سەر خەڵووز بۆ ئاگر کردنەوە .

١-ئاگرگرتن : agirgirtin

ئاگر بەربوون لە کەسێك ، گیاندارێك ، شتێك ، شوێنێك ...هتد .

٢- ئاگرگرتن : agirgirtin

تووڕەبوون و هەڵچوونی زۆر بەتین .

٣- ئاگرگرتن : agirgirtin

بزێوی و زۆر جووڵانی منداڵ .

٤- ئاگرگرتن : agirgirtin

زۆرهێنانی ئاڵۆش و ئارەزووی لەش و گیان بۆ جووتبوون .

٥- ئاگرگرتن : agirgirtin

هێرشهێنانی تاسە و ئارەزووی بەکوڵ بۆ دیداری ئازدار و خۆشەویست .

٦-ئاگرگرتن : agirgirtin

هوروژمهێنانی هێزی شەڕ و دەستوەشاندن .

ئاگرگرتوو : agirgirtû

بڕ. ئاگرتێبەربوون .

ئاگرگورن : agirgurin

بڕ. ئاگرکردنەوە .

ئاگر گووشك : agirgûşik

ئێسقانی چەناگە .

١-ئاگرگیرە : agirgîre

بڕ. ئاگرگرە .

٢-ئاگرگیره : agirgîre

جۆره مەقاشێکه که سکڵ و پۆلوی له ئاگردان و کووره و هتد .. پێدەشێوێنرێت .

ئاگرلەچاوبارین : agirleçawbarîn

بڕ. ١-ئاگر لێبارین .

ئاگر لەدەم : agirledem

١-مرۆڤی فیتنەو قسەگێڕەوە کە تەنیا قسەی خراپ و پڕ لە ئاژاوە بکات .

٢-کەسێک کە بە پەلە پەل بدوێت .

٣-مرۆڤی زۆر بلێ و دەمهەراش کەزۆرتر دەم لە قسەی ناڕەوا و زیانبەخش بکوتێت .

ئاگر لەناوچاوبارین : agirlenawçawbarîn

بڕ ئاگرلێبارین .

ئاگرلز : agirliz

بڕ ئاگرباز .

ئاگرلزی : agirlizî

بڕ. ئاگربازی

ئاگرلێبارین : agirlêbarin

١-تووڕەبون و کەڵلەپیبوونی کەسێک کە غەزەب لەنێو چاوانی ببارێت و کەس نەوێرێت بیدوێنێت.

٢-تووشبوون و گیرۆ دەبوون بە داماگی .

ئاگرلێباریو : agirlêbarîw

مرۆڤ و گیانداری کەڵلەیی هەڵچووگ .

ئاگرلێچوو: agirlêçw

بڕ. ئاگرلێباریوو

ئاگرلێچوون : agirlêçûn

بڕ. ئاگرگرتن ١-

ئاگر مەلووچ : agirmelûç

باڵندەیەکە لە چەشنی ڕیشۆڵە ، باڵ و گەردنڕەش ، پەڕی قاوەیی کاڵە ، ژێر سنگی سووری گەشە . چنگەکانی درێژن . لەکاتی ترێ و توو پێگەیشتندا بەزۆری و پۆل پۆل دەردەکەون و دەدەن بەسەر ڕەزو دارتووەکانداو لەماوەیەکی کەما هەرچی بەر هەیە بنبڕیدەکەن ، هەروەکو ئاگر بەربێتەوە بەو جۆرە ترێ و توو دەخۆن.ناوەکەشی هەر لەوەوە هاتووە .

ئاگرمەلیچ : agirmelîç

بڕ. ئاگر مەلووچ .

ئاگرمەلیچك : agiremeliçik

بڕ. ئاگرمە لووچ .

ئاگرمرێن : agirmirên

بڕ. ئاگر تەمیرۆك .

agirmirênî

ئاگرمرینی :

کاری دامرکاندنەوە و کوژاندنەوەی ئاگر بە ئاو ، خۆڵ ، گاز و ...هتد .

agirnak

ئاگرناك :

١-بارودۆخی مرۆڤی کەللەیی و زۆرتورەو هەڵچوو.

٢-باری هەر شتێك پریشك بهاوێژێت .

٣-باری هەر شتێك کە لە شێوەی ئاگردا بێت.

agirnan

ئاگرنان :

بڕ ئاگرنانەوە

agirnanewe

ئاگرنانەوە :

١-بڕ. ئاگربەردانەوە .

بڕ ئاژاوەنانەوە .

agirnêrewe

ئاگرنێرەوە :

بڕ. ئاگرخۆشکەرە .

agirwaran

ئاگرواران :

بڕ. ئاگرباران

agirudû

ئاگرودوو :

بڕ. ئارودوو .

*خۆشە ئاگر ، خۆشە دوو

براخاسە نـەك وەك شوو

agirudûbiran

ئاگر و دووبران :

کوێربوونەوەی ئاگر و وەجاخی بنەماڵە و خێزان و بڕانەوەی شوێنەواریان .

agirudûbiřîn

ئاگرودووبڕین :

کوێرکردنەوەی وەجاخی بنەماڵە و خێزان و بڕینەوەی شوێنەواریان .

agroçke

ئاگرۆچکە :

١-ئاگری کەم و کز .

٢-ئاگری منداڵان کە بۆ یاریکردن دەیکەنەوە .

agrok

ئاگرۆك :

١-مرۆڤی دوو زبان و دوو رووی ئاشووبگێڕ .

٢-گەرما و شەرایەکە لە مەرەزە دەدات وزیانی دەگەیەنێتێ .

agroke

ئاگرۆکە :

بڕ. ئاگرۆچکە

agirheÎbûnewe

ئاگرهەڵبوونەوە :

بڕ. ئاگر هەڵگیرسانەوە .

agirheÎker
١-ئاگرهەلکەر :
١-ئاگر تێبەردەر .
٢-کەسێکە چرا هەڵدەکات و مۆم دادەگیرسێنێت .

agirheÎker
٢-ئاگر هەلکەر :
کەسێکە ئاگر دەکاتەوە .

agirheÎkirdin
ئاگرهەلکردن :
بڕ. ئاگرپێکردن .

agirheÎgîrsan
ئاگرهەلگیرسان :
١-بڕ. ئاگر تێبەردان .
٢-بڕ ئاژاوەنانەوە .

agirheÎgîrsanewe
ئاگرهەلگیرسانەوە :
١-سەرهەڵدانەوەی ئاگر پاش دامرکاندنەوەی .
٢-بەرپابوونەوە و تازە بوونەوەی ئاژاوە .

agirheÎgîrsandin
ئاگرهەلگیرساندن :
١-بڕ. ئاگرتێبەردان .
٢-بڕ. ئاژاوەنانەوە .

agirheÎgîrsandinewe
ئاگر هەلگیرساندنەوە :
١-سەرلەنوێ ئاگر هەلکردنەوە ، پاش دامرکاندنەوەی .
٢-بەرپاکردنەوە و تازەکردنەوەی ئاژاوە .

agirheÎgîrsanin
ئاگرهەلگیرسانن :
بڕ. ئاژاوە نانەوە .

agirheÎgîrsên
ئاگر هەلگیرسێن :
بڕ. ئاگرمۆکەر .

agirheÎgîrsêner
ئاگرهەلگیرسێنەر :
بڕ. ئاگرمەکەر .

agrî
١-ئاگری :
بڕ. ئاگرین .

agrî
٢-ئاگری :
هەر ڕەنگێك وەکو ڕەنگی ئاگربێت .

agrîbinka
ئاگری بن کا :
بەو ئاگرە دەوترێت کە لە بنکاو دزە دەکات و بەگران دەکوژێتەوە .

agrîbinka
ئاگری بنکا :
کەسێکە لە ژێرەوە بە نهێنی هەوڵی تێکدانی نێوان خەڵك بدات و ئاژاوەبنێتەوە .

agirî bê aman

ئاگرییێنامان :

١-ئاگری زۆر بڵاوەکردوو ، کەزوو بتەنێتەوە و دامرکاندنەوەی گرانبێت .

٢-مرۆڤێك سڵنەکاتەوە و پارێزگاریی ئابڕوو وسەرو ماڵی خەڵك نەکات و زیانیان پێبگەیەنێت .

٣-کەسێك جێگەی باوەڕ و متمانە نەبێت .

٤-نەگبەتی و دەردو بەلا .

agirîjêrka

ئاگری ژێر کا :

بڕ. ئاگری بنکا .

agirîsûr

ئاگری سوور :

بڕ. ئاگرە سوورە .

agirîn

ئاگرین :

١-شتێکی زۆر داخ و ئاگر ئاسا

٢-کەسێکی توندڕەو کەللە ڕەق

٣-شۆڕشگێڕ و تێکۆشەر .

٤-گورجو گۆڵ و بەهەڵمەت لە ئیش و کاردا.

٥-کار ، ڕەفتار ، قسە ، نووسین ...هتد ، جۆش و خرۆشڕەو .

٦-مرۆڤی ئاڵۆشاوی .

agirîqûret

ئاگری قوورەت :

١-منداڵی زۆربزێو و نەسرەوت .

٢-منداڵی شەڕەنگێز ، کە ئازاری منداڵانی دی دەدات .

٣-مرۆڤی ئازا و چاونەترس کەلە هیچ شتێك نەسڵمێتەوە

٤-کارامە وەشارەزا و گورجوگۆڵ لە ئیش و کاردا .

agirêxodê

ئاگرێ خودێ :

بڕ ئاگری قوورەت .

agurdî

ئاگوردی :

بڕ. ئاگرو دوو ١-

agul

ئاگول :

هەڵسوکەوت و وتەی درۆ بەنیازی لە خشتەبردن و دەستبڕین .

aguÎbaz

ئاگوڵباز :

بڕ. ئاپارتی -٢

ago

ئاگۆ :

بڕ . ئەوێ

agos

ئاگۆس :

بڕ. گاسن .

agoskirin ئاگۆسکرن :
کێڵانی زەوی .
agûr ئاگوور :
بڕ. ئاجوور -١
al ١-ئاڵ :
پەنجەی ناوەڕاست کە درێژترین قامکی دەستی مرۆڤە .
al ٢-ئاڵ :
بڕ. ئاڵا
من دڤێ کو ئەز تەهلدم
ئاڵ ڕەنگێ کەسك و سۆر ( عوسمان سەبری )
ala ١-ئالا :
بڕ. ئالاخ .
ala ٢-ئالا :
نیشو کاری دواخرا و بۆ سات و کاتێکی کەم ( جارێ ) .
alax ئالاخ :
١-زێدە گژوگیای زیانبەخشی ناوکشتوکاڵ.
٢-هەڵکێشان و لابردنی گژوگیای زیانبەخشی ناو کشتوکاڵ ( بژار ) .
alastin ئالاستن :
زمانهێنان بە هەرشت و تەنێکدا . ( لستنەوە )
alaf ئالاف :
بڕ. ئامراز .
alifrengî ئالفرەنگی :
پێڵاوی سووری شێوە ئەورووپایی .
alav ١-ئالاڤ :
١- گڕ و کڵپەی ئاگر .
٢- هەڵم و تینی ئاوی بەکوڵ و گەرم .
٣-شەوق و ڕووناکیی بەتینی بەرزەوە بوو لە ئاگر.
alav ٢-ئالاڤ :
بڕ. ئامراز.
alavbûn ئالاڤبوون :
بڕ ئاگرتێبەربوون .
alavgirtin ئالاڤگرتن :
بڕ. ئاگر گرتن .

alavgur

ئالاڤگور :

ئاگر تێبەربوون و بەرز بوونەوەی گڕ و کلپە .

alavgurbûn

ئالاڤگوربوون :

بڕ. ئاگر تێبەربوون-١

alavgurkirin

ئالاڤگورکرن :

بڕ ئاگر تێبەربەردان -١

alavî

ئالاڤی :

بارودۆخی هەر شتێك کە گڕ و هالآوی لێهەڵبسێت.

alaker

ئالاکەر :

ئامرازێکە لە شێوەی بێڵە کانێکی دەمدرێژ و تیژ ، بۆ هەڵکەندنی گژوگیای ڕیشە قووڵ .

alakirde

ئالاکردە :

گژوگیای زیانبەخشی هەڵکێشراو لە مەزرا و کشتوکاڵدا .

alaku

ئالاکو :

ئامرازێکی دەمدرێژکۆڵەی ئاسنە ، دەسکێکی کورتی داری هەیە ، بۆ بژارکردن و پاچەکۆڵەکردن بەکاردێت .

alako

ئالاکۆ :

بڕ. ئالاکو .

alale

ئالالە :

گوڵاڵەیەکی بەهارییە ، زۆرتر لەدەشت و لەناو دەغڵدا دەڕوێت ، لاسکەکەی درێژکۆڵەیە ، کاسەکەی ڕەشە بەدەورانەدەوریدا یەك ڕیز پەڕی سووری ئاڵ هەیە ، بنپەلکەکانی سپین . (گوڵاڵە سوورە ) .

alan

١-ئالان :

بڕ. ئاڵان -١

alan

٢- ئالان :

مرۆڤی ڕوو پەمەیی .

عەنبەرین خەمری و سوسەن ئــــالان

سوورو زەر ، شەتری و چیچەك ئالان ( مەلای جەزیری )

alane

ئالانە :

باخی دامێنی شاخ و کێو .

alan talan

ئالان تالان :

پەلاماردان و ڕاپێچکردنی کەلوپەل و سامانی خەڵك .

alan talankirin

ئالان تالانکرن :

دەست بەسەراگرتن و دزینی پارە و پوول و سامانی خەڵك .

alankirin

ئالانکرن :

بڕ. ئالان تالانکرن .

alahî
ئالاهی :

بڕ. ١-ئالاَ

alet
ئالەت :

بڕ. ئالەت-١

aletdu
ئالەتدو :

بڕ. ئالە تفەڕەنگی .

aĺeke
ئاڵەکە :

نەخۆشییەکی درمی پەرەسێنە ، بەهۆی جۆرە بەکتریایەکەوە تووشی کۆرنیا و لینجە پەردەی پێڵووی ناوموەی چاو دەبێت نەخۆش لە ڕووناکی ئەسڵە مێتەوە و بەترسەوە چاودەکاتەوە ، چاوی ئاو دەکات و دەئێشێت ، بە دەرمان ، یان بە نەشتەرگەری چارەسەردەکرێت .

alewê
ئالەوێ :

ئامرازی ئاماژەیە بۆ دیاریکردنی شوێنی دوور .

alit
ئالت :

بڕ. ئالتبوون .

altax
ئالتاخ :

کەسێکە بە نهێنی سۆراخی دەرخستن و ئاشکرا بوونی تاوان و دزێتی و هتد ... دەکات .

alitbûn
ئالتبوون :

١-دۆڕان و ژێر کەوتن و شکان لە شەڕدا .

٢-سەرکەوتنی مرۆڤ لەهەر کارو پرۆژەیەکدا .

alitker
ئالتکەر :

کەسێکە لە شەڕدا زاڵبێت و سەربکەوێت .

alitkiranî
ئالتکرانی :

نەبەزین و هەمیشە سەرکەوتن .

alitkiran
ئالتکران :

١-زاڵبوون بە سەردوژمندا .

٢-سەرکەوتن لەهەرکارو پرۆژەیەکدا .

alitebûn
ئالتەبوون :

بەرەنگاریکردن و خۆگرتن و نەبەزین لەشەڕدا .

alitnebûyî
ئالتنەبوویی :

کەسێك ، لەناو لە شکرێك و... هتد لەشەڕدا کۆڵنەدات و نەبەزێت .

alitnekrî
ئالتنەکری :

بڕ. ئالتنەبوویی .

alitkiranî

ئالتكرانى :

١-کەسێکە هەمیشە و هەردەم سەردەکەوێت.

٢-نەبەزین و کۆڵنەدان و زاڵبوون لەشەڕدا .

alxiwax

ئالخواخ :

بڕ. ئاڵخواخ .

alûzkirdin

ئالووزکردن :

شەوقپێهەڵێنانی شت بە سڕینەوە و لووسکردنی

alişt

ئالشت :

بڕ. ئاڵشت .

aliştî

ئالشتی :

بڕ. ئاڵشتی .

aliştkirde

ئالشتکردە :

بڕ. ئاڵشتکردە .

alif

ئالف :

بڕ ئاڵف .

alifdan

ئالفدان :

بڕ. ئاڵفدان .

alvêr

ئالڤێر :

بڕ. ئاڵشت -١

alvêrçî

ئالڤێرچی :

بڕ. ئاڵفێرچی .

alik

ئالك :

١- بڕ. ئاڵوو .

٢- بڕ. ئالیك -١

aÎgirtin

ئالگرتن :

بڕ. ئاریکاندن .

al lele

ئالله لە :

بڕ. ئاقیق .

alindeng

ئالندەنگ :

کەسێکە کە بێکارە و لێنەهاتوو بێت و بێهوودە بسوورێتەوە .

alûbalû

ئالوو بالوو :

بڕ. ئاڵوو باڵوو .

aluçe

ئالوچە :

هەتوانێکە لەشی منداڵی پێچەور دەکرێت .

aluçedan
ـتوچەدان :
چەورکردنی لەشی منداڵ بە ئالوچە .

alûz
ـتووز :
ـر ئازار

alûz
٠-ئاتووز :
ـر ١- ئالوز -٢

alûz
٢- ئاتووز :
ـتەرەویکی شاشە لە لۆکە دەچنرێت و دروستدەکرێت بۆ برینپێچان .(شاش ) .

alûzkirin
ـئاتووزکرن :
ـر ئاتوزاندن ٢، ٣ ، ٤، ٥ .

alûzkirin
٢- ئاتووزکرن :
هەستکردن بە باری دەروونپری لە ئەنجامی بێتوانایی و نەبوونی بواری سەربەستیی دەروونی بۆ دەربڕینی هەستی گیان و ئا
هەندێك جاریش لامل و ڕوومەت سوور هەڵدەگەڕێن .

alûle
ـئالوونە :
ـکووچە و کۆڵانی تەنگەبەر .
٢-کەسێکی بێشەرم و بێنابڕوو .

alûnek
ـئالوونەك :
ـخوچکەیەك کە لەناو باخ و بێستاندا دروستدەکرێت ، سەری بەدار و ژاژو قامیش و زەل دەگیرێت بۆ چاودێریکردنی باخ و
بێستان

aÎoq
ـئاتوق :
ـر ئالوو .

aÎoq
٢-ئاتوق :
ـحەسەری گری و قوڵفە و وەڵەف .

aÎû
ـئالوو :
ـر ئالو

alûçe
ـئالووچە :
ـر ئالوچە .

alûd
ـئالوود :
ـر ئالوودە .
گەرد ئالوودەن دەور مەزار لەیلێ
ـەر پەخشی و ماڵاش لازمەن خەیلێ ( مەولەوی )

alûde
ـئاتوودە :
ـکەسێك . گیاندارێك کە هۆگری کەسێك ، یان گیاندارێك ، یان شتێك بوویێت و بەبێئەو هەڵنەکات .
٢-کەسێك کە حەزو ئارەزووی لەکەسێك ، یان شتێك بێت .

۲-ئالووده : alûde

دوو شت ، یان یاتر که زیاتر تێکەڵ بەیەك بوون .

تۆ خوردو خوراك ، تۆ پۆشاکی

ئالوودەی خوێن دڵـــی پاکـــی . ( فۆلکلۆر )

ئالوودەبوو : alûdebû

بڕ.ئالووده .

ئالووده بووگ : alûdebûg

بڕ. ئالووده .

۱-ئالوودەبوون : alûdebûn

۱-ڕاهاتنی چەند کەسێك ، یان چەند گیاندارێك و پێکەوە هەڵکردن و پتەو بوونی گیانی لەنێوانیاندا .

۲-خووگرتن و پەیوەستبوون بەهەرشتێکەوە .

۲-ئالوودەبوون : alûdebûn

تێکەڵبوونی دووشت و زیاتر .

ئالوودەبییە : alûdebiye

بڕ. ئالوودەبوو .

ئالوودەبییەی : alûdebiyey

بڕ. ئالوودەبوون .

ئالوودەبیی : alûdebiyî

بڕ. ئالووده ( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .

۱-ئالوودەکەر : alûdeker

۱-کەسێك کە چەند کەسێك ، یان چەند گیاندارێك لەگەڵ یەکتردا هۆگر بکات و یەکیانبخات .

۲-کەسێك کە حەزو ئارەزووی نێوان چەند کەسێك ، یان گیاندارێك بهێنێتەدی .

۲- ئالوودەکەر : alûdeker

کەسێك کە چەند شتێك تێکەڵبکات .

ئالوودەکەرە : alûdekere

بڕ. ئالوودەکەر . ( بۆ مێ )

ئالوودەکەردەی : alûdekerdey

بڕ. ئالوودەکردن .

۱-ئالوودەکراو : alûdekiraw

۱-چەند کەسێك ، یان چەند گیاندارێك کە لەگەڵ یەکتر هۆگرکرابن .

۲-چەند کەسێك ، یان چەند گیاندارێك کە حەزو ئارەزوویان هێنرابێتەدی .

۲-ئالوودەکراو : alûdekiraw

چەند شتێك کە ئاوێتە و تێکەڵکرابن .

١- ئالوودەكردن : alûdekirdin

هۆگرکردن و یەکخستنی چەند کەسێك ، یان چەند گیاندارێك .

٢-ئالوودەكردن : alûdekirdin

تێکەڵکردن و ئاوێتە کردنی دووشت ، یان زیاتر .

ئالوودەكریا : alûdekirya

بڕ. ئالوودەکراو .

ئالوودەكریاگ : alûdekiryag

بڕ. ئالوودەکراو .

ئالوودەكریاو : alûdekiryaw

بڕ. ئالوودەکراو .

ئالوودەكریێ : alûdekiryê

بڕ. ئالوودەکراو ( بۆمێ و بۆ کۆ ) .

ئالوودەگی : alûdegî

بڕ. ئالوودەیی .

ئالوودەیی : alûdeyî

بارودۆخی ئالوودەبوون .

ئالووری : alûrî

مرۆڤ و گیانداری هەمیشە بەئاڵۆش .

١-ئالووز : alûz

هەستێکی کاریگەری دەروونییە ، لە ئەنجامی کارەسات و ڕووداوی ناخۆشەوە سەرهەڵدەدات و دەبێتە مایەی گیاندارگرتن .

٢-ئالووز : alûz

مرۆڤی جوان و خۆێنشیرین و ئێسکسووك .

ئالووزی : alûzî

ڕێکپۆشی و ئێسکسووکی و شۆخ و شەنگیی کەسێك کە بچێتە دڵەوە .

ئالووس : alûs

١-ئاڵو والاّپۆش

٢-بڕ. ئالووز

ئالووسی : alûsî

بڕ . ئالووزی

١-ئالی : alî

١-هەر فرمان و مەبەستێك کە بە کەسێك ڕابگەیەنرێت .

٢-هەست و ئاگاداری لەهەر کارو فەرمانێکدا .

٢-ئالی : alî

هەرلاو شوێنێك

alî
٣-ئالی :
ئەو جێ و ڕێ و شوێنەی کە دەکەوێتە ناو ڕەشماڵەوە .

alîxanî
ئالیخانی :
بڕ. ئەلیخانی

alîbalî
ئالیبالی :
بڕ. ئالۆو باڵوو -٢

alî be alî
ئالی بە ئالی :
١- پێچ و پەناو توونا و تoونی هەر شوێنێك .
*ئالی بە ئالی ئەم شاخەم تەیکرد ، بەلاَم نەمدۆزیتەوە .
٢-دوو گۆشەی بەرانبەر بەیەك لە لاكێشە و چوارگۆشەدا .

alîbûn
ئالیبوون :
١- پێراگەیاندنی فەرمان و مەبەست بەکەسێك .
٢-هەستکردن و ئاگاداربوون لەکارو مەبەستێك .

alîdan
ئالیدان :
١-وەلاخستنی مرۆڤ و گیاندار و هەرشتێك.
٢- پشتگوێخستن و گوێ پێنەدان .

alîstin
ئالیستن :
زمانهێنان بەهەرشتێکدا .

alîsor
ئالیسۆر :
١-بڕ. ئاڵ -١
٢-هەرمێ و سێوە لاسوورە .

alîştolîşt
ئالیشتۆلیشت :
بڕ.ئالشتو نۆلشت .

alîfçî
ئالیفچی :
کەسێکە کە ئالف بفرۆشێت .

alifdan
ئالفدان :
بڕ. ئاڵفدان .

alifzar
ئالفزار :
بڕ. ئاڵفجار .

alîfkirin
ئالیفکرن :
بڕ . ئاڵفدان .

aliqandin
ئالیقاندن :
بڕ. ئالیقین

aliqîn

ئاليقين :

١-بەيەكبەستنەوەى دوو شت ، يان زياتر.

٢-بەريەككەوتن لەكاتى رۆيشتن و راكردندا ، هتد .

٣-بەيەكگەيشتنى دوو مرۆڤ و پتر ، يان دووگياندار و دووشت و زياتر .

alîk

ئاليك :

١-كاو جۆ ، گلێنە ، گزرمو لەوەرى هەلگيراو بۆ رەشەولاخ و ولاخى بەرزمو مەر و مالات .

٢-ژمێك ئاليكى دراو بەچارەوێ و رەشە ولاخ .

alîkar

١-ئاليكار :

بر. ئاريكار .

alîkar

٢- ئاليكار :

شارەزاو كارامە لە راپەراندنى ئيش و كاردا .

alîkarî

ئاليكارى :

بر. ئاريكارى

alîkane

ئاليكانە :

بر. ئالفانە .

alîkdan

ئاليكدان :

١-دانانى كاو جۆ و ئالف بۆ ولاخ و چارەوێ.

٢-ئەو شوێنەى كە كاو جۆ و گزرمو كەماو لۆ و ....هتد ، تێدا هەلدەگيرێن .

alîkday

ئاليكداى :

بر. ئاليكدان .

alîkder

ئاليكدەر :

كەسێك كە كاو جۆ و ئالف بۆ ولاخ و چارەوێ رۆبكات و دابنێ .

alîkdere

ئاليكدەرە :

بر. ئاليكدەر ( بۆ مێ )

alîkirdin

ئاليكردن :

١-ئاگاداركردنى كەسێك لەهەوالێك پەيامێك ، فرمانێك ...هتد .

٢-بر. ئاگاداركردن .

alîkî

ئاليكى :

يەك لاى هەر شوێن و شتێك .

alîkîdan

ئاليكيدان :

دانان و خستنە لايەكەوە .

alîkîva

ئاليكيڤا :

١- سەرەراى ئەوەى ، سەربارى ئەوەى .

٢-لەلايەكى هەرشت و شوێنێكەوە .

alîn

١-ئالين :

١- خوگرمۆڵه کردن و خۆ هێنانەوه يەك .

٢- پێچانەوه و تۆپەڵەکردنی ڕایەخ ، پێخەف ، پۆشاك و ....هتد .

alîn

٢- ئالين :

بڕ. ئالآندن .

alîncîkuÎîncî

ئالينجی کوڵينجی :

یارییەکی فۆلکلۆری منداڵانە ، دوو منداڵ پشت بە پشتی يەکترەوه دەنێن و لەبنباڵەوه قۆڵ لە قۆڵی يەکتر گيردەکەن و بەچەماندنەوە يەکتر دێنن و دەبەن و دەڵێن :-

ئالينجی و کۆڵينجی : کەوای باوکم زەفتنجی .

alînok

ئالينۆك :

١-نۆکی هاڕدراو .

٢-لەتکە نۆك .

alyor

ئاليۆر :

سێوە لاسوورە .

alêre

ئالێرە :

ئامرازی ئاماژەيە بۆ دياريکردنی شوێنی نزيك .

alêstin

ئالێستن :

بڕ. ئاليستن .

aÎ

١-ئاڵ :

ڕەنگی سووری گەش .

aÎ

٢- ئاڵ :

بوونەوەرێکی ئەفسانەييە ، دەڵێن دەچێتە وێزەی زەيستان ، دەستدەنێتە بينی و دەردی گراندەکات و دەيکوژێت .

aÎ

٣- ئاڵ :

نەخۆشييەکە تووشی زەيستان دەبێت و دەيکوژێت .

aÎ

٤- ئاڵ :

مرۆڤی فێڵباز و تەڵەکەباز .

aÎ

٥- ئاڵ :

بڕ. ئالآن .

aÎ

٦- ئاڵ :

دەستەو تاقم و کۆمەڵ .

aÎ

٧- ئاڵ :

بڕ. ئالآ

aÎ

٨- ئاڵ :

سڕی و تەزيويی ددان بەخواردن و خواردنەوەی ترش .

aÎ aÎ ئالنال :

گولێکی بنج ڕەنگاوڕەنگی بۆنخۆشە .

aÎa ١-ئالا :

پارچە قوماشێکی سادە ، یان ڕەنگاوڕەنگ بۆنیشانەی دەوڵەت ، یان دەزگا و ڕێکخراو .

aÎa ٢- ئالا :

بڕ. ئالابێژ .

aÎa ٣- ئالا :

شتی باش و پەسەند و پوخت .

aÎa ٤- ئالا :

خامە و قەڵەمی نووسین .

aÎa ٥- ئالا :

جلو بەرگی بووکە شووشە .

aÎa ٦- ئالا :

١-هەرچی شتێك کەلە لەبەرزاییدا بێت و دەست نەیگاتێ .

٢-مرۆڤ ، شت کە پلە و پایەیان بالا بێت .

aÎaber ئالا بەر :

بڕ. ئالادار .

aÎaboheÎkirdin ئالا بۆهەڵکردن :

بڕ. ئابڕوو بردن (١،٢) .

aÎabêj ئالابێژ:

هێلەك و قوماشی شاش بۆ دابێژان .

aÎabêjkirdin ١-ئالابێژکردن:

بێژانەوە بە ئالابێژ .

aÎabêjkirdin ٢- ئالابێژکردن:

هەڵبژاردن و جیاکردنەوەی شتی باش لە خراپ کە ئاوێتە و تێکەڵبن .

aÎat ئالات :

بڕ. ئالەت .

aÎatin ئالاتن :

بڕ. ئالاندن .

aÎaco ئالاجۆ :

شێوە ژوورێکی چادر ئاسایە ، لە لباد دروستدەکرێت ، لەباتی چادر بەکاردەهێنرێت .

aÎaçix ئالاچخ :

بڕ ئالوونەك .

aÎax
ئالآخ :
بڕ. ئالاخ .
aÎadar
ئالآدار :
کەسێکە لە لەشکر و خۆپیشاندان و ڕێپێواندا ئالآ و دروشم هەڵبگرێت .
aÎazyan
ئالآزیان :
پالکەوتن و درێژ بوون لەسەر زەوی و جێگاونوێن.
aÎastin
ئالآستن :
١-بڕ.ئالیستن .
٢-لێوخستنە سەرلێو ، دەم ، کوڵم و مژینیان .
aÎastî
ئالآستی :
١-هەر کەسێك ، گیاندارێك ، شتێك کەلێسرابێتەوە .
٢-کەسێك کە ماچکرا بێت .
aÎaş
١-ئالآش :
١- توێژاڵی قەد و لقی درەخت .
٢-تەلاشێکی تەنك کە بەڕەندە لە دارو تەختە بکرێتەوە.
aÎaş
٢-ئالآش :
لق و پۆپ و چڵی کەوتووی وشکەوەبووی دار و درەخت .
aÎaş
٣-ئالآش :
ناتەواوی و کەموکووڕی و نەنگیی مرۆڤ .
aÎafî
ئالآفی :
بڕ. ئالآڤی .
aÎav
ئالآڤ :
ئامرازو کەرەسەی کشتوکاڵ .
aÎava
ئالآڤا :
بڕ. ئالاڤ .
aÎavbûn
ئالآڤبوون :
بڕ. ئاگرتێبەربوون .
aÎavgirtin
ئالآڤگرتن :
بڕ. ئاگرگرتن .
aÎavgurkirin
ئالڤگورکرن :
بڕ. ئاگر تێبەردان -١
aÎavî
ئالآڤی :
بڕ. ئالاڤی .

aÎamet

ئالأمەت :

بڕ. ئارسم .

aÎan

١-ئالأن :

١- پێچخواردنی دووشت ، یان زیاتر بەیەکا .

٢-خۆ هەڵواسین بەکەسێکدا بێجیابوونەوە .

aÎan

٢- ئالأن :

گیرۆدە بوون بەگێچەڵ و بەلأوە .

aÎan

٣- ئالأن :

بڕ. ئالان تالان .

aÎan

٤- ئالأن :

دەسبەکاربوون و خەریکبوون بەرهەمان و شتێکەوە

*هۆکابرا ، بۆ ئالأویتە ئەودارە ؟

aÎan taÎan

ئالأن تالأن :

بڕ. ٣ .ئالأن .

aÎandin

ئالأندن :

١-لەیەکپێچاندن و بادانی دوو شت ، یان زیاتر بەیەکدا .

٢-گیرۆدەکردن بەکێشە و دەردو بەلأ .

٣-هەڵکردنی داو ، ڕیسراو ، ڕێسمان و هەودا .

٤-بڕ. ئالۆزکاو .

٥- پێچانەوەی شت و بەستنی بە پەت و هتد.

aÎanin

ئالأنن :

بڕ. ئالأندن .

aÎankirin

ئالأنکرن :

بڕ. ٣-ئالانتالان .

aÎaw

ئالأو :

پەت ، گوریس ، تەل ، هتد ، کەلە کەسێك گیاندارێك ، شتێکەوە ئالأ بێت .

aÎawwaÎa

ئالأ و والأ:

بڕ. ئاڵو والأ .

aÎawwaÎapoş

ئالأ و والأپۆش :

بڕ. ئاڵو والأپۆش .

aÎaheÎgir

ئالأهەڵگر :

بڕ. ئالأدار .

aÎaheÎgirtin

ئالأهەڵگرتن :

بەرزکردنەوەی ئالأ و دروشم لەکاتی جەنگ و ڕا پەڕین و خۆپیشاندان و ڕێپێواندا .

ئالأهورگر : aÎahurgir
بڕ. ئالأدار .
ئالأهورگره : aÎahurgire
بڕ. ئالأدا ( بۆ مێ )
ئالأهورگرتەی : aÎahurgirtey
بڕ. ئالأهەلگرتن .
ئالأهی : aÎahî
بڕ. ١-ئالأ .
ئالأیش : aÎayiş
١-بەزم و ئاهەنگ و کۆڕی شەو ڕابواردن .
٢-بڕ. ئاریشت .
ئالأیشت : aÎayişt
ڕەوشت و خووی نەگونجاو لەگەڵ دەوروبەر و کۆمەڵدا .
ئالأیشتکرن : aÎayiştkirin
لادان لە ڕەوشت و خوو و داب و نەریتیی کۆمەلأیەتی پەیڕەوکراو .
١-ئالأیی : aÎayî
١-ڕەنگا و ڕەنگ
٢-بە چەشنی ئالأ .
٣-بڕ. ئالو والأ
٢-ئالأیی : aÎayî
بەشێك لە لەشکری عوسمانی کە لیوایەك بووە .
١-ئالە : aÎe
نەخۆشییەکی پێستە لەدەموچاوی ئافرەتی سکپڕ دەدات و پەڵە پەڵەیدەکات .
٢-ئالە : aÎe
ئەسپی شێ .
٣-ئالە : aÎe
بڕ. ئاڵ .
٤- ئالە : aÎe
تەنراوی شاش بۆ دابێژتن .
٥- ئالە : aÎe
خورووی ئاو گەڵ .
٦- ئالە : aÎe
نەخۆشییەکی پێستە وەك گەڕی وایە ، تووشی ئەسپ و ولأخ دەبێت .

aÎebûk
ئاله بووك :
سەره پڕشتی قوماش و پەڕۆی ڕەنگاو ڕەنگ کە کچۆلان دەیکەنە بەرگی بووك .

aÎebêj
ئاله بێژ :
بڕ. ئالآبێژ .

aÎebêjkirdin
ئاله بێژکردن :
بڕ. ئالآبێژکردن .

aÎet
١- ئاڵەت :
رووەکێکە لەناوچە گەرمەکاندا دەڕوێت ، بەرێکی دەنك ڕەش ، یان سووری بۆرەقلەی توندو تیژ دەگرێت . دەهاردرێت و دەکرێتە ناو هەندێك خواردەمەنییەوە ، بۆ تام و بۆخۆشکردنی .

aÎet
٢- ئاڵەت :
پارچە تەختەی باریك و تەنك تاشاوی تێکهەڵکێشراو لە پە نجەرە سازیدا .

aÎetac
ئاڵەتاج :
جۆرە مراوییەکی کێویی سپی خاڵخاڵە ، پەڵەیەکی سەوز بە تەوقی سەریەوەیەتی .

aÎetanc
ئاڵەتانج :
بڕ. ئاڵەتاج

aÎetawî
ئاله تاوی :
١- خوراردەمەنییەك کە ئاڵەتی پێوەکرابێت .
٢-کەسێك کە زوو هەڵبچێت و تووڕە بێت .

aÎetawiye
ئاله تاوییه :
بڕ. ئاله تاوی ( بۆ مێ ) .

aÎetpokirya
ئاڵەت پۆکریا :
بڕ. ئاڵەتاوی

aÎetpokiryê
ئاڵەت پۆکریێ :
بڕ. ئاله تاوی ( بۆ مێ و کۆ ) .

aÎetekêwîle
ئاڵەتەکێویلە :
گیایەکی خۆڕسکە لە گوێ ئاوان دەڕوێت ، بەرێکی ورد و خڕی هێشوویی مۆر دەگرێت و چێژی لە ئاڵەت دەچێت .

aÎetpêwekiraw
ئاڵەتپێوەکراو :
بڕ. ئاڵەتاوی

aÎetçermig
ئاڵەتە چەرمگ :
بڕ. ئاڵەتە کێویلە .

aÎetdan
ئاڵەتدان :
دەفرێکی بچکۆلەیە ، سەرقاپەکەی کونکونە ، ئاڵەتی هاڕدراوی تێدەکرێت .

aÎetdu
ئاڵەتدو :
بڕ. ئاڵەتدان .

aÎetfeřengî
ئاڵەتفەرەنگی :
سەوزەیەکە ، ناوەکەی تۆوی زۆری تێدایە ، تیژ و شیرینچکیان هەیە . ( بیبەر ) .
aÎetkar
ئاڵەتکار :
وردەکارو شارەزا و پسپۆڕ لەهەر پیشە و کارێکدا .
aÎetkarî
ئاڵەتکاری :
شارەزایی و پسپۆڕی و وردەکاری لە دارتاشی و هەندێك پیشەی تردا .
aÎetkiraw
ئاڵەتکراو :
بڕ. ئاڵەتاوی .
aÎetkirya
ئاڵەتکریا :
بڕ ئاڵەتاوی .
aÎetkiryag
ئاڵەتکریاگ :
بڕ. ئاڵەتاوی .
aÎetkiryaw
ئاڵەتکریاو :
بڕ ئاڵەتاوی .
aÎetkiryê
ئاڵەتکریێ :
بڕ. ئاڵەتاوی ( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .
aÎetî
ئاڵەتی :
بڕ. ئاڵەتاوی .
aÎeçok
ئاڵە چۆك :
تەنراوێکی ئەستوورە لە چەند تەختەیەکی لێکدراو هەڵدووراوە ، لە دەشتو دەردا هەڵدەدرێت بۆ تێدا ژیان و حەسانەوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو . ( ڕەشماڵ ، دەوار ) .
aÎeçoknişîn
ئاڵەچۆکنشین :
کەسێك کە لەناو ئاڵە چۆکدا بژیت و بحەوێتەوە. ( دەوارنشین ) .
aÎefeřenge
ئاڵە فەرەنگە :
١-شێوە و ڕەفتاری کەسێك کەلاسایی بیانیان بکاتەوە .
٢-هەر دابو دەستور و ڕەفتار و شتێك کە مۆرکی بیانی پێوە بێت .
aÎeqoq
ئاڵە قۆق :
بڕ. ئاڵە کۆك .
aÎekuke
ئاڵە کوکە :
بڕ. ئاڵەکۆك .
aÎekok
ئاڵەکۆك :
گیایەکی بەهارەیە ، بێلاسکە ، پەلکەکانی درێژکۆلە و گرنج گرنج و تووکنن ، بەسەرزەویدا پەلنەهاون .
*دیاریی شوان ئاڵەکۆکە . ( هەنەکۆك ) .

aÎewbiyey
ئاڵەوبییەی :
بڕ. ئاڵبوونەوە .

aÎbaÎû
ئاڵباڵوو :
بڕ. ئاڵو باڵوو .

aÎbilaÎuk
ئاڵبلاڵوك :
بڕ. ئاڵۆ بەلاڵووك .

aÎberdey
ئاڵبەردەی :
بڕ. ئاڵبردنەوە .

aÎberdî
ئاڵبەردی :
بڕ. ئاڵبردوو .

aÎbirdû
ئاڵبردوو :
زەیستانێك کە ئاڵ بردبێتی .

aÎbirdinewe
ئاڵبردنەوە :
مردنی زەیستان بە دەردی ئاڵ .

aÎobiyey
ئاڵۆبییەی :
بڕ. ئاڵبوونەوە .

aÎbûnewe
١-ئاڵبوونەوە :
سڕبوون و تەزینی ددان لە ئەنجامی خواردنەوە و خواردنی شتی ترشدا .

aÎbûnewe
٢-ئاڵبوونەوە :
کارتێکردنی زۆر لە ئەنجامی بیستن و دیتن و بەسەرهاتی ناڵەبارو دڵتەزێندا .

aÎbûnewe
٣-ئاڵبوونەوە :
مووچرکهاتن بەلەشدا لە ئەنجامی لێکخشاندنی دوو شتدا .

aÎbûnewe
٤- ئاڵبوونەوە :
سوور بوونەوە و ئارەقکردنەوە لە ئەنجامی تەریقبوونەوەدا .

aÎit
١-ئاڵت :
بڕ. ئاڵتبوون .

aÎit
٢- ئاڵت :
کەمێك لە کێش و سەنگی شت .

AÎtûn
ئاڵتوون :
١-کانزایەکی گرانبەها و بەنرخە ، ڕەنگێکی زەردی دڵگیری هەیە ، ڕۆژگارێکی دوور و درێژ دەمێنێتەوە بە بێئەوەی تێکبچێت و خراپبێت ، نرخی سامان و پارەی وڵاتان بە پێی ئەو دادەنرێت .
٢-کەسێك ، یان شتێکی گرانبەهاو زۆر بایەخدار.
٣-هەر شتێك لە ئاڵتوون دروستکرابێت .

aÎtûn asa
ئاڵتووناسا :
١-هەر شتێك بەوێنەی ئاڵتوون بنوێنێت .
٢-بڕ. ئاڵتوون -٢

aÎtûnî
ئاڵتوونی :
١-هەر شتێك ڕەنگی وەکو ڕەنگی ئاڵتوون بێت .
٢-بڕ. ئاڵتوون -٣

aÎtûnîye
ئاڵتوونییە :
بڕ. ئاڵتوونی ( بۆ مێ ) .

aÎithatin
ئاڵتهاتن :
کەمهێنانی کێش و سەنگی هەر شتێك .

aÎithênan
ئاڵتهێنان :
بڕ. ئاڵتهاتن .

aÎtîrem
ئاڵتیرەم :
سەنگێکە بریتییە لە شەست و چواریەکی هۆقە و دەکاتە ( ٥٥ ) گرام .
* پیاوەکە ئاڵتیرەم نانی خوارد ، نەبێ فلتیرم نەقلی هەبێ . ( پەندی پێشینان )

aÎçax
ئاڵچاخ :
١-مرۆڤی سووك و ڕسوا و بێشەرم و بێئابڕوو .
٢-مرۆڤی ساختەچی و دەسبڕ.

aÎçaxe
ئاڵچاخە :
بڕ. ئاڵچاخ . ( بۆ مێ ) .

aÎçaxî
ئاڵچاخی :
١-سووکی وڕسوایی و بێشەرمی و بێئابڕوویی .
٢-دەسبڕی و ساختەچییەتی .

aÎçaq
ئاڵچاق :
بڕ. ئاڵچاخ .

aÎçaqî
ئاڵچاقی :
بڕ. ئاڵچاخی

aÎxiwax
ئالخواخ :
پە نجەی دۆشاو مژە .

aÎdûz
١-ئاڵدووز :
١- بڕ. ئاومزێڕ .

aÎdûz
٢-ئاڵدووز :
وتە و بەڵێن و دەمتەڕیی بۆش و پووچەڵ و پڕلە درۆ و دەلەسە . ( رووکەش ) .

aÎdûzkar

ئاڵدووزكار :

كەسێكە كە ئاڵدووزی بكات .

aÎdûzkarî

ئاڵدووزكاری :

رووكەشكردنی شت بە زێڕ، یان زیو ،یان شتی تر.

aÎdûzkirdin

ئاڵدووزكردن :

رووكەشكردنی كانزاو هەندێك شتی تر بە ئاوی زێڕ و زیو

aÎsik

ئاڵسك :

بڕ. ئاڵشت .

aÎiske

ئاڵسكە :

بڕ. ئاڵشت .

aÎişt

١-ئاڵشت :

١- كڕین و فرۆشتن و سەوداو و مامەڵە .

٢-گۆڕینەوەی شت بە شت .

aÎişt

٢- ئاڵشت :

١- بارودۆخی ئاورنگ پێش ئەوەی ببیەستێت .

٢-توێژاڵێكی تەنكی بەفر ئاسا .

aÎişte

ئاڵشتە :

بڕ. -٢ ئاڵشت -١

aÎiştkirde

ئاڵشتكردە :

١-دانان ، یان وەرگرتنی شتێك لە جێی شتێكی تر .

٢-دانانی پارە ، یان شتێك لە بری شتێك . (بژار دراو ) .

aÎişt uoÎişt

ئاڵشت ئۆڵشت :

سەوداو مامەڵە بە گۆڕینەوەی شت ،گیاندار و كەلوپەل ، بەهاوتا و چەشنی خۆیان .

aÎiştî

١-ئاڵشتی :

١-منداڵی لاواز و بێهێز .

٢-بەگاڵتەوە بەمنداڵی لاواز دەوترێت كە گوایا جنۆكە گۆڕیویێتی و لاوازیكردووە .

aÎiştî

٢-ئاڵشتی :

بڕ. -٢ ئاڵشت .

aÎişvêriş

ئاڵشڤێرش :

بڕ. ١-١ ئاڵشت -١

aÎişvêrişkirin

ئاڵشڤێرشكرن :

بڕ ١- ئاڵشت -١

aÎişk
ئاڵشك :
١-بڕ . ٢- ئاڵشت .
٢-توێژاڵە سەهۆڵی سەر چاڵاوی بچووك لەشەوانی زۆرساردا.
aÎişkî
ئاڵشكی:
شتێك ، شوێنێك ، كە زوقمی لێ نیشتبێت .
aÎif
ئاڵف :
١-لەوەڕی هەڵگیراو و پاشاكەوتكراو بۆ مەڕ و ماڵات و چارەوێ .
٢-گژوگیا و لەوەڕی سەوزی نەدووراو .
٣-دانەوێڵەی درشت و هاڕدراو بۆ ئاژەڵ و مەڕ و ماڵات و ڕەشە وڵاخ و چارەوێ .
aÎfane
ئاڵفانە :
باجێكە ئاغا و دەرەبەگان خستوویانەتە سەر ئاژەڵدار و مەڕ و ماڵاتداران . لە بری ئەو ئالیكەی كۆیدەكەنەوە بۆ زستان .
aÎifbiřyey
ئاڵفبڕیەی :
بڕ ئاڵفبڕین .
aÎifbiřîn
ئاڵفبڕین :
دروونەوەو هەڵگرتنی لەوەڕ .
aÎifte
ئاڵفتە :
بڕ. ئالوودە .
aÎifcař
ئاڵفجاڕ :
هەر شوێنێك كە لەوەڕی زۆری هەبێت .
aÎifdan
١-ئاڵفدان :
١-بڕ. ئاخوڕ.
٢-شوێنێكی تایبەتە بۆ هەڵگرتنی ئاڵف .
aÎifdan
٢-ئاڵفدان :
دانان و پێدانی ئاڵف بە ئاژەڵ و مەڕ و ماڵات .
aÎifday
ئاڵفدای :
بڕ. ٢-ئاڵفدان .
aÎifder
ئاڵفدەر :
كەسێك كە ئاڵف بدات بەئاژەڵ و مەڕ و ماڵات .
aÎifdere
ئاڵفدەرە :
بڕ. ئاڵفدەر ( بۆ مێ ) .
aÎifzar
ئاڵفزار :
بڕ. ئاڵفجاڕ .
aÎvêr
ئاڵڤێر :
بڕ. ئاڵشت -١

ئالڤێرچی : aÎvêrçî

١-کەسێکە پیشەی کڕین و فرۆشتنە .

٢-کەسێکە کە دووکان و شوێنی تایبەتی هەبێت بۆ کڕین و فرۆشتن .

ئالقارێز : aÎqařêz

بڕ. ئەڵقەڕێز .

ئالقە : aÎqe

بڕ. ئەڵقە .

ئالقە بە گوێ : aÎqebegiwê

بڕ. ئەڵقە بە گوێ .

ئالقەتێز : aÎqetêz

بڕ. ئالقەتیژ .

ئالقەتیژ : aÎqetîj

گیایەکی کێویلەی گەڵا خڕکۆڵەیە ، بستێك بەرزدەبێتەوە ، شلەمەنییەکی شیر ئاسای تێدایە بۆ ڕەوانی باشە .

ئالقەتیس : aÎqetîs

بڕ. ئالقەتیژ .

ئالقەڕێز : aÎqêřêz

بڕ. ئەڵقەڕێز

ئالقەڕێزکردن : aÎqeřêzkirdin

بڕ. ئەڵقەڕێزکردن .

ئالقە زوونە : aÎqezûne

بڕ . ئاخزووم

ئالقە لە گوێ : aÎqelegiwê

بڕ. ئەڵقە بە گوێ .

١-ئالك : aÎik

بڕ . ئالوو .

٢-ئالك : aÎik

بڕ ئالیك -١

ئالکاو : aÎkaw

بڕ. ئالۆز .

١-ئالگ : aÎig

شوێنی برین و ئازار و لێدان لەسەر لەشی گیاندار.

٢-ئالگ : aÎig

بڕ . ئالوو .

ئاڵگوون : aÎgûn

هەر ڕەنگێك كە سوور و گەشبێت .

ئاڵلە لە : aÎlele

بڕ. ئاقیق .

ئاڵنگ : aÎing

١-بڕ ئاڵوو .

٢-خڕبوونی بنهەنگڵ و بنڕان لە ئە نجامی ئازاری دەست و قۆڵ و لاق و پێدا .

ئاڵنگهاتن : aÎinghatin

بڕ. ئاڵوو كەوتن .

ئاڵنگی : aÎingî

بەرسیلەی تفت و وشك كە هێشتا ئاوی پەیدا نەكردبێت .

ئاڵوالا : aÎwaÎa

بڕ. ئاڵووالا .

ئاڵوو باڵوو : aÎûbaÎû

١-جۆرە گیلاسێكی دەنك ورد و زۆر ئاڵە .

٢-هەڵووژە وردە .

ئاڵو بەلاڵووك : aÎubeÎaÎûk

١-دەوەنێكی گەلا وردە ، دارەكەی سووری زەرد باوە

٢-بەری داری ئاڵوو بەلاڵووك ، كە ورد و خڕە و گیلاسئاسایە ، بەلام ئەم تفتترە .

١-ئاڵوبۆڵ : aÎuboÎ

بەرسیلەیەك ، كە دەنكە دەنكەی گەییـبێـت و شیرین بوو بێت .

٢-ئاڵو بۆڵ : aÎuboÎ

كچ و كوڕی هەرزەكارو تازەپێگەیشتوو .

١-ئاڵوبۆڵبوون : aÎuboÎbûn

بوونی بەرسیلە بە ئاڵوبۆڵ .

٢-ئاڵو بۆڵبوون : aÎuboÎbûn

گەیشتنە تەمەنی هەرزەكاری .

ئاڵوچە : aÎuçe

١-درەختێكی بەردارە ، قەدو لقەكانی زبر و سوور باون ، كەتیرەیەكی سەوزباو دەردەدەن ، گەلاكەی نیمچە درێژكۆڵەیە.

٢-بەری درەختی ئاڵووچە بەرێكی قەبارە مام ناوەندییە ،ئاوكێكی ڕەقی گەورەی هەیە،تامەكەی ترش ، مزر ،یان شیرینە .

ئاڵوچیارە : aÎuçyare

بڕ. ئاوێزان .

ئاڵودار : aÎudar

١-داری دارەڕا .

٢-کەسێك کە ئاڵووی کەوتبێ یان ئاڵووی هەوی کردبێت .

ئاڵوز : aÎuz

بڕ. ئاڵۆز .

ئاڵوزە : aÎuze

بڕ. ئاڵۆز ( بۆ مێ ) .

ئاڵۆزنای : aÎuznay

بڕ. ئاڵۆزاندن .

ئاڵوگۆڕ : aÎugoř

١-گۆڕینەوەی شتێك بە شتێك ( شتگۆڕینەوە ) .

٢-جێگۆڕین لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر .

٣-جلو بەرگ گۆڕین .

ئاڵوگۆڕبوون : aÎugořbûn

گۆڕانی دوو شتی لەیەکچوو لەگەڵ یەکدا .

ئاڵوگۆڕ کەر : aÎugořker

١-کەسێك کە شتێك ، گیانلەبەرێك بگۆڕێتەوە بە شتێك ، یان گیاندارێکی تر .

٢-کەسێك کە شتێك ، کەسێك گیاندارێك لە شوێنێکەوە دەبات بۆ شوێنێکی تر .

٣-کەسێکە کە شتێك ، مرۆڤێك ، گیاندارێك لە شوێنێك لابەرێت و یەکێکی تر بخاتە جێی .

ئاڵوگوڕکەردەی : aÎuguřkerdey

بڕ. ئاڵوگۆڕکردن .

ئاڵوگۆڕکراو : aÎugořkiraw

١-شتێك بە شتێکی تر گۆڕدرابێتەوە .

٢-جێگە پێگۆڕدراو .

٣-جلو بەرگی گۆڕدراو .

٤-شتێك ، کەسێك ، یان گیاندارێك کە لە شوێنێك لا برابێت و یەکێکی تری لە جێگا دانرابێت .

١- ئاڵوگۆڕکردن : aÎugořkirdin

گۆڕینەوەی شت بە شت .

٢- ئاڵوگۆڕکردن : aÎugořkirdin

هێنان و بردنی شت ، گیاندار ، مرۆڤ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر .

٣- ئاڵوگۆڕکردن : aÎugořkirdin

لابردنی شتێك ، مرۆڤێك ، یان گیاندارێك لە شوێنێك و دانانی یەکێکی تر لە شوێنی .

ئاڵوگوڕکریا : aÎuguřkirya

بڕ. ئاڵوگۆڕکراو .

aÎugořkiryag
ئاڵوگۆڕکریاگ :
بڕ. ئاڵوگۆڕکراو .

aÎugořkiryaw
ئاڵوگۆڕکریاو :
بڕ. ئاڵوگۆڕکراو .

aÎuwaÎa
ئاڵو والا :
ڕەنگاو ڕەنگ و جوان .
تـــا بڵێی تـــەڕ پـــوش ئاڵو والا جـــل
بەژن و بالا جوان ، بەدەن نەرم و شل (گۆران)

aÎuwaÎapuş
ئاڵو والاپوش :
بڕ. ئاڵو والاپۆش .

aÎuwaÎapuşay
ئاڵو والاپوشای :
بڕ. ئاڵو والا پۆشین .

aÎuwaÎapuşe
ئاڵو والاپوشە :
بڕ. ئاڵووالاپۆش ( بۆ مێ ) .

aÎuwaÎapoş
ئاڵو والا پۆش :
مرۆڤی تەڕ پۆش کە جلو بەرگی ڕەنگا و ڕەنگ و جوان لەبەر بکات .

aÎuwaÎî
ئاڵو واڵی :
بڕ. ئاڵو والا ( بۆ مێ و کۆ ) .

aÎo
ئاڵۆ :
برای دایک ( خاڵ ) .

aÎobiyey
ئاڵۆبییەی :
بڕ. ئاڵبوونەوە .

aÎoz
١-ئاڵۆز :
مرۆڤ و گیاندار کە باری دەروونییان نا ئاسایی و ناڕەحەت بێت .

aÎoz
٢- ئاڵۆز :
مێشک و دەروونی نالەبارو سەخڵەت .

aÎoz
٣- ئاڵۆز :
دوورە پەرێز نەگونجاو لەگەڵ دەوروبەردا .

aÎoz
٤- ئاڵۆز :
کۆسپ و تەگەرە و کێشەی سەخت و ناهەموار .

aÎoz
٥- ئاڵۆز :
کەشوهەوای نا هەموار .

aÎozan
١-ئاڵۆزان :
شێوان و تێکچوونی سەروقژ .

aîozan
٢- ئاڵۆزان :
تێکچوونی کارومەبەستێك بە شێوەیەکی دژوار .
aîozan
٣- ئاڵۆزان :
تووڕە بوون و هەڵچوونی مرۆڤ و گیاندار و شێوانی باری ئاساییان .
aîozan
٤- ئاڵۆزان :
تێکچوونی پەیوەندی و دۆستایەتیی نێوان خەڵك.
aîozan
٥- ئاڵۆزان :
بەرپابوون و بڵاوبوونەوەی ئاژاوە لە نێوان خەڵکدا .
aîozan
٦- ئاڵۆزان :
تێکئالآنی هەوداو پەت و دەزوو ... هتد .
aîozandin
١-ئاڵۆزاندن :
شێواندنی قژی شانەکراو .
aîozandin
٢- ئاڵۆزاندن :
تێکدانی کارو مەبەستێك بەجۆرێکی وا کە چارەسەرکردنیان ئاسان نەبێت .
aîozandin
٣- ئاڵۆزاندن :
تووڕە کردن و هەڵچوواندنی مرۆڤ و گیاندار و شێواندنی باری ئاساییان .
aîozandin
٤- ئاڵۆزاندن :
تێکدانی دۆستایەتی و پەیوەندیی نێوان خەڵك .
aîozandin
٥- ئاڵۆزاندن :
بەرپاکردن و بڵاوکردنەوەی ئاژاوە لە نێوان خەڵکدا .
aîozandin
٦- ئاڵۆزاندن :
تێکئالآندنی هەودا و پەت و دەزوو ...هتد .
aîozaw
ئاڵۆزاو :
بڕ. ئاڵۆز .
aîozpaîoz
ئاڵۆز پاڵۆز :
بڕ . ئاڵۆز پلۆز .
aîozpiîoz
ئاڵۆز پلۆز :
ئاژاوە و هەرا لە نێوان خێزان و کۆمەڵدا .
aîozkan
١-ئاڵۆزکان :
ڕەنگپەڕینی ڕوخسار و زەرد هەڵگەڕانی لە ئەنجامی نەخۆشی و ترس و ....هتد .
aîozkan
٢- ئاڵۆزکان :
بڕ. ئاڵۆزان .
aîozkandin
ئاڵۆزکاندن :
بڕ.ئاڵۆزاندن .

ئاڵۆزکاو : aÎozkaw

بڕ. ئاڵۆزاو .

ئاڵۆزکاوی : aÎozkawî

١-دۆخی ئاڵۆزکانی بەن ، دەزوو ، شتی تر.

٢-باری هەڵچوون و کەللەیی و تووڕە بوون.

٣-دۆخ و ئاستی هەراو ئاژاوە و ئاشووب .

٤-بارودۆخی نەگونجان .

٥-دۆخی کەژ و ئاو و هەوای تێکچوو .

٦-بارودۆخی نەبوونی ئاسایش و هێمنی لەناوکۆمەڵدا .

ئاڵۆزکەر : aÎozker

١-کەسێك ، یان گیاندارێك کە بێتە هۆی تووڕە بوون و هەڵچوونی کەسان و گیاندارانی تر .

٢-مرۆڤێك ، یان گیانلەبەرێك ، ناخ و دەروون ، سەخڵەتبکات و سەرو دڵ بگرێت .

٣-کەسێك ، یان شتێك ببێتە مایەی نەگونجانی دەوروبەر

٤-کەسێك کە هەراو ئاژاوە بەرپا بکات .

٥-کەسێك کە پەت و هەودا ....هتد . تێکبئاڵێنێت .

ئاڵۆزکەرە : aÎozkere

بڕ. ئاڵۆکەر ( بۆ مێ )

ئاڵۆزکراو : aÎozkiraw

١-کەسێك ، گیاندارێك کە سەرکرابێتە سەریان و تووڕە و هەراسانکرابن .

٢-کەسێك کە زۆر سەرکرابێتە سەری و سەرشکێن و تەنگە تاو کرابێت .

٣-کەسێك کە بارودۆخی دەروونی خراپ و شێوێنرابێت و چەواشە و سەر لێشێواو بوو بێت .

ئاڵۆزکردن : aÎozkirdin

بڕ. ئاڵۆزاندن .

ئاڵۆزکرن : aÎozkirin

بڕ. ئاڵۆزاندن .

ئاڵۆزکریا : aÎozkirya

بڕ. ئاڵۆزکراو .

ئاڵۆزکریاگ : aÎozkiryag

بڕ. ئاڵۆزکراو .

ئاڵۆزکریاو : aÎozkiryaw

بڕ. ئاڵۆزکراو .

ئاڵوزکریێ : aÎuzkiryê

بڕ. ئاڵوزکراو

alozkêndiraw

ئالۆزکێندراو :

بڕ. ئالۆزکراو .

aÎozkênraw

ئالۆزکێنراو :

بڕ. ئالۆزکراو .

aÎozî

ئالۆزی :

بڕ. ئالۆزکاوی

aÎozya

ئالۆزیا :

بڕ. ئالۆزراو .

aÎozyag

ئالۆزیاگ :

بڕ ئالۆزاو .

aÎozyaw

ئالۆزیاو :

بڕ. ئالۆزاو .

aÎozyay

ئالۆزیای :

بڕ. ئالۆزان .

aÎozên

ئالۆزێن :

بڕ. ئالۆزکەر .

aÎozêner

ئالۆزێنەر :

بڕ. ئالۆزکەر .

aÎozêniraw

ئالۆزێنراو :

بڕ . ئالۆزکراو .

aÎos

ئالوس :

بڕ. ئالۆز .

aÎoskan

ئالۆسکان :

بڕ. ئالۆزکان .

aloskandin

ئالۆسکاندن :

بڕ ئالۆزاندن .

aloskaw

ئالۆسکاو :

بڕ. ئالۆزکاو .

aÎoskawî

ئالۆسکاوی :

بڕ. ئالۆزکاوی .

aÎosker

ئالۆسکەر :

بڕ. ئالۆزکەر .

aÎuskere

ئالوسکەرە :

بڕ. ئالۆزکەر (بۆ مێ)

ئالۆسكەردەی : aÎuskerdey

بڕ. ١، ٢ ئالۆزاندن

ئالۆسكراو : aÎoskiraw

بڕ. ئالۆزكراو .

ئالۆسكردن : aÎoskirdin

بڕ. ١، ٢ ئالۆزاندن .

ئالوسكیا : aÎuskiya

بڕ ئالۆزاو .

ئالۆسكیاگ : aÎoskiyag

بڕ. ئالۆزاو .

ئالۆسكیاو : aÎoskiyaw

بڕ. ئالۆزاو .

ئالوسكیای : aÎuskiyay

بڕ. ئالۆزكان

ئالۆسكێنراو : aÎoskêniraw

بڕ. ئالۆزكراو .

ئالوسكییێ : aÎuskiyê

بڕ. ئالوسكاو .

ئالۆسی : aÎosî

بڕ. ئالۆزكاوی .

ئالۆش : aÎoş

١-خارشت و خورووی هەر ئەندامێكی لەش ، یان سەراپا لەش ( خوروو ) .

٢-ئارەزووی بەتین و بەجۆش و خرۆشی لەش و گیان بۆ دیدار و پێكگەیشتن و جووتبوون .

ئالۆشاوی : aÎoşawî

١-ئادەمیزادی خوتك و پڕ ئالۆش .

٢-هەر شتێك كە ئالۆش پەیدا بكات .

٣-شتێك كە خرووك و ئالۆشی هەبێت .

ئالوشاوییە : aÎuşawîye

بڕ. ئالوشاوی ( بۆ مێ ) .

ئالۆشە : aÎoşe

توێكلی قەد و لقی درەخت .

ئالۆشتێكەوتن : aÎoştêkewtin

هێرش و تین و هوروژهێنانی ئالۆش .

ئاڵوشدار : aÎuşdar

بڕ. ئاڵۆشاوی .

ئاڵوشداره : aÎuşdare

بڕ. ئاڵۆشاوی ( بۆ مێ )

ئاڵۆشگرتن : aÎoşgirtin

بڕ. ئاڵۆشتێکەوتن .

ئاڵووشگرتەی : aÎûşgirtey

بڕ ئاڵۆشگرتن .

ئاڵۆق : aÎoq

بڕ. ١-ئاڵوو .

ئاڵو وێر : aÎuwêr

بڕ. ئاڵو وێڵ .

ئاڵو وێرکردن : aÎuwêrkirdin

سەوداو و مامەڵە کردنی سەرپێیی .

ئاڵو وێڵ : aÎuwêÎ

سەودا و مامەڵەی سەر پێیی .

١-ئاڵوو : aÎû

١- دوو لووی بچکۆلەی بادەمین لە سەرەتای ئەملاونەولای گەردوودان ، ئەگەر هەو بکەن ، ئێش و ئازار پەیدا ئەکەن.

٢-لوویەك ، یان کۆمەڵە لوویەکە ، کە لەهەندێ شوێنی لەشدان ، ئەگەر ئەندامێکی نزیکیان ئازاری هەبێت ئەم لووانە دەئاوسێن و ئازار پەیدا دەکەن .

* ئاڵووی زامەکە داویەتیە بن باخەڵم

٢-ئاڵوو : aÎû

بڕ. ئاڵوو باڵوو .

ئاڵووچە : aÎûçe

بڕ . ئاڵوچە .

ئاڵووس : aÎûs

بڕ. ئاڵۆز.

ئاڵووکەوتن : aÎûkewtin

١-ئازار گەیشتن بە ئاڵووی مل پەهۆی بەرزی و نزمی و باری نا ئاسایی سەرینەوە لەکاتی خەوتندا .

٢-هەوکردنی ئاڵوو .

ئاڵووگرتنەوە : aÎûgirtinewe

دەستهێنان بە گەروودا لە دیوی دەرەوە ، لە ئاستی لووی ئاڵۆودا بۆ چارەسەرکردنی ئاڵووکەوتن .

١-ئاڵووڵە : aÎûÎe

کووچە و کۆڵانێك کە دەرنەچێت .

aÎûÎe
٢ ـ [illegible]
مرۆڤی بیئابروو .

aÎûhatin
ئالووهاتن :
بر. ئالووکەوتن .

aÎûheÎdanewe
ئالوو هەڵدانەوە :
١-فرووك تێهەڵسوونی ئالووی هەوکردوو لەدیوی ناوەوە بە پەنجەی دۆشاو مژە بۆ تیمارکردنی .
٢-داپچڕاندنی دەمی ئالووکەوتوو بەهۆی نوشتاندنەوەی پەنجە گەورەی نەخۆشەکەوە .
٣-داپچڕاندنی زاری ئالووکەوتوو بەوەی کە پەنجە گەورەی لەهەردوو جومگەدا بچەمێنێتەوە و لە باری درێژی بیخاتە نێوان هەردوو شەویلگەیەوە و هەتا دەتوانێت دەمی دابچڕێت ، بۆ ئەوەی ئالووی بچێتەوە شوێنی خۆی

aÎhe
ئالهە :
بر. نومێد .

aÎî
١-ئاڵی :
پیاوێك کە گوێڕایەڵی ژنەکەی بێت و لە قسەی دەرنەچێت و لێی بترسێت .

aÎî
٢- ئاڵی :
سەوزی و کەشیی هەرشتێك

aÎye
ئالیە :
ویست و خواستی دەروونی .

aÎîzengan
ئالیزەنگان :
بر. ١-ئاڵ ٢،٣ .

aÎîşt
ئالیشت :
بر. ئالشت .

aÎîştbûn
ئالیشتبوون :
١-بر. ١-ئالشت -٢ .
٢-گۆڕانی ڕەنگی ، یان شتێك ، یان کەسێك .
٣-هەڵگرتن و بردنی شتێك لە باتی شتێکی تر ، بە بێ ئەوەی بزانرێت .

aÎîşkirdin
ئالیشکردن :
١-گۆڕینی ڕەنگی پێستی مرۆڤ لە ئەنجامی نەخۆشی ، یان بەدخۆراکیدا .
٢-گۆڕینەوەی شتێك بە شتێك .

aÎês
ئالێس :
بر. ئالیستن .

aÎêk
ئالێك :
بر. ئالف .

aÎêkdan
ئالێکدان :
بر. ئالیکدان .

aÎên

ئالێن :

١-کەسێکە کە پەت ، هەودا ، دەزوو و ...هتد ، لەیەك بئاڵێنێت .

٢-کەسێکە کە خۆی هەڵبواسێت بە کەسێك ، یان شتێکدا.

٣-کەسێکە خەڵك گیرۆدەی گێچەڵ و بەلاّ بکات .

am

١-ئام :

پێشگرێکە لەگەڵ هەندێك ناودا دێت و ناوی دارێژراوی لێدروستدەکات ، بەواتای هاوبەشی وەك : ئامراز ، ئامسا ، ئاموالأتی .

am

٢-ئام :

توانایەکی پەنهانی یەزدانییە، لەلەشدا ،تا لەلەشدا بێت گیاندار زیندووە ،کەنەماو دەرچوو لەشی گیاندار دەمرێت ( گیان )

ama

١-ئاما :

کەسێك بەرەو جێ و شوێنێك نزیکبێتەوە .

ama

٢- ئاما :

کارو مەبەستێك کە بە نە نجامبگات .

amac

١-ئاماج :

بر ئامانج .

amac

٢-ئاماج :

بر . ئامادە .

پەی دیدەی بەدان ، تیر بییەن ئاماج

کـــافییەن مـەلأی شکستە ئـەفـواج (مەلا عەباسی کاکەیی)

amad

ئاماد :

بر. ئامادە .

amade

١-ئامادە :

هەر کەسێك ، هەر شتێك کە تەیار و سازبێت .

amade

٢-ئامادە :

گەچی تازەگیراوەی بەهێزو نەمردوو .

amade

٣- ئامادە :

کەسێك کە لە کات و شوێنی دیاریکراوا بێت *( سەعات دوو لەلات ئامادەم ).

amade

٤- ئامادە :

هەر کەسێك قایلبێت بۆ سازدانی هەرکارێك .

amadebûn

ئامادەبوون :

١-تەیار بوون و سازبوونی هەر کەسێك ، یان هەر شتێك .

٢-هاتن و گەیشتنە جێ لەکات و ساتی خۆیدا .

٣-قایلبوونی هەر کەسێك بۆ سازدانی هەرکارو مەبەستێك

amadebiyey
ئامادەبییەی :
بڕ. ئامادە بوون .
amadeker
ئامادەکەر :
کەسێك کەشت ، شوێن ، مرۆڤ ...هتد ، تەیار و ساز و ئامادە بکات .
amadekere
ئامادەکەرە :
بڕ. ئامادەکەر ( بۆمێ ) .
amadekerdey
ئامادەکەردەی :
بڕ. ئامادەکردن .
amadekiraw
ئامادەکراو :
کەس و شتی ساز و تەیارکراو .
amadekirdin
ئامادەکردن :
سازکردن و ڕێکخستن و تەیارکردنی کەسێك ، شتێك ، شوێنێك ....هتد .
amadekirya
ئامادەکریا :
بڕ. ئامادەکراو .
amadekiryag
ئامادەکریاگ :
بڕ. ئامادەکراو .
amadekiryaw
ئامادەکریاو :
بڕ. ئامادەکراو .
amadekiryê
ئامادەکریێ :
بڕ. ئامادەکراو ( بۆ مێ و کۆ ) .
amadegî
ئامادەگی :
بڕ. ئامادەیی .
amadeyî
ئامادەیی :
تەیاری و سازی و ڕێکوپێکیی کەس ، شت ، شوێن ...هتد . سەرژمێری و ڕێکخستنی شتی ژمێردراو .
amarat
ئامارات :
ئامرازو کەلوپەلی پیشەسازی .
amare
ئامارە :
بڕ. ئاوارە .
amarkar
ئامارکار :
کەسێکە کە سەر ژمێریدەکات و ئە نجامەکەی ڕێکدەخات .
amarker
ئامارکەر :
بڕ. ئامارکار .
amarkere
ئامارکەرە :
بڕ. ئامار کار ( بۆ مێ ) .

ئاماركەردەی : amarkerdey

بڕ. ئاماركردن .

ئاماركراو : amarkiraw

هەر شتێك كەسەر ژمێركرابێت و ڕێكخرا بێت .

ئاماركردن : amarkirdin

سەرژمێركردن و ئەژماردنی شت و ڕێكخستنی ئەنجامەكەی

ئاماركریا : amarkirya

بڕ. ئاماركراو .

ئاماركریاگ : amarkiryag

بڕ. ئاماركراو .

ئاماركریاو : amarkiryaw

بڕ. ئاماركراو .

ئاماژ : amaj

١- بڕ. ئاوات .

٢-هەر شتێك كە بنرێتەوە ، یان دەستنیشانبكرێت بۆ ئەوەی تیر ، بەرد و ... تاد... تێبگیرێت

مـــەنزڵانی دوور بەجای وێم كـەردم

وێم كەرد بەئاماژ پەی تانەی مەردم (بێسارانی)

ئاماژە : amaje

پەنجە درێژكردن بۆ شوێنێك ، یان بزوتنی سەر ، چاو ، بۆ پیشاندان و دەستنیشانی كەسێك ، یان شتێك .

ئاماژە بۆ كەر : amajeboker

بڕ. ئاماژەكەر .

ئاماژە بۆ كراو : amajebokiraw

بڕ. ئاماژەكراو .

ئاماژە بۆ كردن : amajebokirdin

بڕ. ئاماژەكردن .

ئاماژە بۆ كریا : amajebokirya

بڕ. ئاماژەكراو .

ئاماژە بۆ كریاگ : amajebokiryag

بڕ. ئاماژەكراو .

ئاماژەبۆكریاو : amajebokiryaw

بڕ. ئاماژەكراو .

ئاماژەپەی كەر : amajepeyker

بڕ. ئاماژەكار .

amajepeykere
ئاماژە پەی کەرە :
بڕ. ئاماژەکەر ( بۆ مێ ) .

amajepeykerdey
ئاماژە پەی کەردەی :
بڕ. ئاماژەکردن .

amajepeykirya
ئاماژەپەی کریا :
بڕ. ئاماژەکراو .

amajepeykiryê
ئاماژە پەی کریێ :
بڕ. ئاماژەکراو ( بۆ مێ و کۆ )

amajeker
ئاماژەکەر :
کەسێك کە ئاماژە بکات بۆ شوێنێك ، شتێك ، گیاندارێك ....هتد .

amajekere
ئاماژەکەرە :
بڕ. ئاماژەکەر ( بۆ مێ ) .

amajekerdey
ئاماژەکەردەی :
بڕ. ئاماژەکردن .

amajekiraw
ئاماژەکراو :
١-کەسێك گیاندارێك ، شتێك کە پەنجەی بۆ ڕاکێشرابێ
٢-کەسێك ، گیاندارێك ، شتێك کە دەستنیشانکرابێ .

amajekirdin
ئاماژەکردن :
پەنجە ڕاکێشان ، دەست درێژکردن ، یان سەرو چاو جووڵاندن مەبەستی پیشاندان و دەستنیشانکردنی کەسێك ، شتێك ، شوێنێك ...هتد .

amajekirya
ئاماژەکریا :
بڕ ئاماژەکراو .

amajekiryaw
ئاماژەکریاو :
بڕ. ئاماژەکراو .

amajekirêy
ئاماژە کرێی :
بڕ. ئاماژەکراو ( بۆ مێ و کۆ ) .

amas
١-ئاماس :
بلقی پێست و جەستە لە ئەنجامی ئاوتێزاندا .

amas
٢- ئاماس :
بڕ. ئاوساو .

amasan
ئاماسان :
بڕ. ئاوسان .

amasya
ئاماسیا :
بڕ. ئاوساو .

ئاماسیاگ : amasyag

بڕ. ئاوساو .

ئاماسیان : amasyan

بڕ. ئاوسان .

ئاماسیاو : amasyaw

بڕ. ئاوساو .

ئاماسین : amasîn

بڕ. ئاوسان .

ئاماڵ : amaÎ

١-بڕ. ئامپا -٣

٢-دوو کەس ، دوو گیاندار ، یان زیاتر کە لە سیماو شێوە و ڕەنگدا و ...هتد لەیەك بچن .

١-ئامان : aman

بڕ. ١-ئاسایش .

٢- ئامان : aman

پەناو داڵدە و هانا .

٣- ئامان : aman

١- وشەی هاوار و هەی داد و داوای یارمەتی و فریاکەوتن .

٢-وشەی پاڕانەوە و دامانگرتن .

ئەرچێوم واتەن جــە تــاوی زامان

وەنەم نەگێری ، ئامان سەد ئامان (بێسارانی)

٤- ئامان : aman

کاسە و کەوڵی مسین و ...هتد .

٥- ئامان : aman

١- جێی بڕوا .

*زۆردار ئامانی نییە .

٢-سۆز و بەزەیی .

ئامان ئامان ، ئامانم تێ

بۆ حاڵی یار گریانم تێ ((فۆلکلۆر))

ئامانئاوەر : aman awer

بڕ. ئامانخواز .

ئامانئاوەرە : aman awere

بڕ. ئامانخواز ( بۆ مێ ) .

ئامانئاوەردەی : aman awerdey

بڕ. ئامانهێنان .

ئامانئاور : aman awir
بڕ. ئامانخواز .
ئامانئاوره : aman awire
بڕ. ئامانخواز ( بۆ مێ ) .
ئامانئاوردەی : aman awirdey
بڕ. ئامانهێنان .
ئامانەت : amanet
١-کەسێك ، گیاندارێك ، شتێك کە سپێردرابێت بە کەسێك بۆ پاراستنی بۆ ماوەیەك .
٢-شتی خوازراو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو .
٣-بڕواو متمانە .
ئامانەتی : amanetî
١-کەس و شتی سپێردراو بەکەسێك بۆ پاراستن .
٢-قسە و باس و شتێکی سپێردراو بەکەسێك ، بۆ ئەوەی خەڵکی تر نەزانێت .
٣-لەباتی ناوی شتێکی سپێردراو کە نەویسترێت ناوی بهێنرێت .
*ئامانەتییەکەتم پێگەیشت
١-ئامانەتدان : amanetdan
سپاردنی کەسێك ، یان شتێك بە کەسێك بۆ پاراستنی بۆ ماوەیەك .
٢-ئامانەتدان : amanetdan
١- ڕاسپاردنی کەسێك بۆ کڕینی شتێك ، یان هێنانی .
٢-بڕ. ئاماندان .
ئامانەتدای : amanetday
بڕ. ئامانەتدان .
ئامانبەر : amanber
کەسێکە کە پەناو دالدە بەرێتە بەر کەسێکی تر .
ئامانبەره : amanbere
بڕ. ئامانبەر ( بۆ مێ ) .
ئامانبەردەی : amanberdey
بڕ. ئامانخواستن .
ئامانبردن : amanbirdin
بڕ. ئامان خواستن .
ئامانپەنەدای : amanpeneday
بڕ. ئاماندان .
ئامانپەنەدەر : amanpeneder
بڕ. ئاماندەر .

amanpenedere
ئامانپەنەدەرە :
بڕ. ئاماندەر ( بۆ مێ ) .

amanpenedirya
ئامانپەنەدریا :
بڕ. ئاماندراو .

amanpenediryê
ئامانپەنەدریێ :
بڕ. ئاماندراو ( بۆ مێ و بۆ کۆ )

amanpêdan
ئامانپێدان :
بڕ. ئاماندان .

amanpêdiraw
ئامان پێدراو :
بڕ. ئاماندراو .

amante
ئامانتە :
بڕ. ئاوانتە .

amanteçî
ئامانتەچی :
بڕ. ئاوانتەچی .

amanc
١-ئامانج :
هیواو مەبەست و شتێك کە لە دەروونا ڕەچاو کرابن .
* ئاما نجمان ڕزگارییە .

amanc
٢- ئامانج :
بڕ. ئاماژ-١

amanc
٣- ئامانج :
کەسانی نزیك بە بنەماڵە و خزم و خوێش .

amanc
٤- ئامانج :
خواسات و مەبەست و هیوای مرۆڤ کە هەوڵنەدات وەدەستیان بهێنێت و بیانگاتێ .

amance
ئاما نجە :
بڕ. ئامانج .

amanxiwaz
ئاما نخواز :
کەسێك کە داوای پەناو داڵدە لە کەسێکی تر بکات .

amanxiwastin
ئاما نخواستن :
هانا و پەنا بردن بۆ لای کەسێك بە مەبەستی داڵدە پێدان و پاراستن و یارمەتیدان .

amandar
ئاماندار :
کەسێك کە ئامانداریبکات .

amandarî
ئامانداری :
چاودێری و ئاگا بوون لە کەسێك ، یان لە شتێك و پاراستنیان .

ئاماندان : amandan

١-داڵدە و پەنادان و پاراستنی لێقەوماو .

٢-ماوە و ڕێدان بۆ دەربڕینی بیروڕاو مەبەست بێترس و پرسینەوە .

ئاماندای : amanday

بڕ. ئاماندان .

ئاماندەر : amender

کەسێك کە داڵدەو پەنای کەسێك بدات کە لێقەوماو بێت

ئاماندەرە : amandere

بڕ. ئاماندەر ( بۆ مێ ) .

ئاماندراو : amandiraw

لێقەوماو کە داڵدە و پەنای درابێت .

ئاماندریا : amandirya

بڕ. ئاماندراو .

ئاماندریاگ : amandiryag

بڕ. ئاماندراو .

ئاماندریان : amandiryan

بڕ. ئاماندان .

ئاماندریاو : amandiryaw

بڕ. ئاماندراو .

ئاماندریێ : amandiryê

بڕ. ئاماندراو ( بۆ مێ و کۆ ) .

ئامانلەرزانە : amanlerzane

بەستەیەکی بەسۆز و بەجۆشی کوردییە .

ئامانلەرزانە ، هــــاڕەی لەرزانە

بەستەی هەڵپەڕکێی بالاّ بەرزانە (گۆران)

ئامانواز : amanwaz

بڕ. ئامانخواز .

ئامانوازە : amanwaze

بڕ . ئامانخواز ( بۆ مێ ) .

ئامانواستەی : amanwastey

بڕ. ئامانخواستن .

ئامانوشیان : amanuşyan

بڕ. ئاموشۆ .

ئامانهێنان : amanhênan

هانا و پەنا هێنان بۆ لای کەسێك بە مەبەستی دالْدەدان و پاراستن و یارمەتیدان .

١-ئاماوزێ : amawzê

تەنراوێکی تەنکە دەخرێتە سەر برین .

٢-ئاماوزێ : amawzê

مشەمای تەنك کە بۆ لابردنی ئازار لە شوێن ئازار دادەنرێت

ئاماولواکەر : amawliwaker

بڕ. ئاموشوکەر .

ئاماولواکەرە : amawliwakere

بڕ. ئاموشۆکەر . ( بۆ مێ )

ئاماولواکەردەی : amawliwakerdey

بڕ. ئاموشۆکردن .

ئاماولوای : amawliway

بڕ. ئاموشۆ .

١- ئامای : amay

نزیکبونەوە و گەیشتنە بەرەو جێگە و شوێنێك .

٢- ئامای : amay

بەئە نجامگەیشتن و سەرگرتنی کارو مەبەستێك .

ئامایەنە : amayene

بڕ. ئاتن .

ئامایی : amayî

نەمان و لەدەستدانی بینایی .

ئامایپەنە : amaypene

بڕ. ئاماپینە .

ئامای پنە : amaypine

وتن و دانپیانان و پێزانین بە ئە نجامدانی هەرکارو مەبەستێك .

ئامەد : amed

بوار و دەرفەتی پڕ خێر و بێر و بەختی باش .

ئامەزۆنی : amezonî

ئافرەتی گەلێکی شەڕ کەر و جەنگاوەری ئەفسانەیین ، ولآتەکەیان پیاوی تێدا نەبووە ، سالْی جارێك ئەیانهێشت لە ولآتی دراوسێیانەوە پیاو بێتە لایان ، بەمەبەستی هێشتنەوەی توخمەکەیان ، ئەگەر کوڕیان ببوایە ، یان ئەیانکوشتن ، یان ئەیاننادرنەوە بۆ باوکیان ، هەر لە منداڵییەوە کچەکانیان فێری شەڕکردن و ئەسپ سواری دەکردن ،مەمکیشیان دەسووتاندن ، یان دەبڕینەوە ،بۆ ئەوەی ڕێی تیر هاوشتنیان لێنەگرن ، هەر شارێکیان بگرتایە کاولیاندەکرد و پیاوەکانیان دەکوشتن و شارێکی تریان لەجێگای دروستدەکرد .

ameşo
ئامەشۆ :
بڕ. ئاموشۆ
amba
ئامبا :
بڕ. ئامپا
ambar
١- ئامبار :
دوو ولاخ ، دوو ئۆتومبیل ، یان یاتر کە باریان لە سەنگ و قەبارە و چەشندا چوونیەکبن .
ambar
٢- ئامبار :
دوو کەس ، یان زیاتر کە لە دەردو بەلاّ و پەژارەدا وەك یەکبن .
ambazbû
ئامبازبوو :
١-کەسێك ، یان شتێك کە ناو قەدی کەسێك ، یان شتێکی کە بێت .
٢-کەسێك ، یان گیاندارێك کە یەخەی کەسێك بگرێت و پەلاماریبدات.
٣-دووکەس کە بە تاسە و پەرۆشەوە باوەشبکەن بە یەکتردا .
ambazbûg
ئامباز بووگ :
بڕ. ئامبازبوو .
ambazbûn
١-ئامبازبوون :
باوەش بەیەکدا کردن بە پەرۆشەوە .
ambazbûn
٢- ئامبازبوون :
یەخەگرتن بەنیازی شەڕ پێفرۆشتن .
ambazbiyey
بڕ. ئامبازبییەی :
بڕ. ئامبازبوون .
ambazbiyî
ئامبازبیی :
بڕ. ئامبازبوو ( بۆ مێ و کۆ )
ambazdbû
ئامبازدبوو :
بڕ. ئامبازبوو .
ambazbûn
ئامبازبوون :
بڕ. ئامبزبوون .
ambayî
ئامبایی :
بڕ. ئامپایی
ampa
ئامپا :
١-دووکەس لەڕۆیشتندا وەك یەکبن .
٢-دوو کەس ، یان زیاتر وەك یەك شارەزاو کارامەبن .
ampayî
ئامپایی :
١-چوونیەکی لە ڕۆیشتندا .
٢-چوونیەکی خەڵك و شارەزایی و کارامەییان لە ئیش و کاردا .

ampyaÎe
ئامپیاڵە :
دووکەس ، یان پتر کە بەیەکەوە بخوێنەوە .

amta
ئامتا :
بڕ. ئاوتا .

amtayî
ئامتایی :
بڕ. ئاوتایی .

amdagirtî
ئامداگرتی :
هەر شتێك كە هی هەموان ، گشتی و هاوبەشیی تێکڕایی بێت .

amraz
١-ئامراز :
هەرکەرەستە و پارچەیەك وەکو :
( چەکوش ، تەشوێ ، ماڵە ، گاسن ) کە لە ئیشکردندا بەکاربهێنرێت .

amraz
٢- ئامراز :
هەندێك وشەو پیتی تایبەت لە ڕێزماندا کە مەبەستی تایبەت ئەگەیەنن، وەکو ئامرازی پەیوەندی .

amřa
ئامڕا :
١-دوو کەس ، یان پتر کەهەمان بیروباوەڕیان هەبێت .
٢-دوکەس ، یان پتر کە ئامانج و مەبەستیان یەك بێت .

amřaz
ئامڕاز :
١- دوو کەس ، یان زیاتر کە هەست و دەردو بۆچوونیان چوون یەك ، یان لەیەکترەوە نزیکبن. ( هاوڕاز ) .
٢-کەسێك کە جێی باوەڕ بێت و بێترس نهێنیی لەلا بدرکێنرێت .

amřazî
ئامڕازی :
١-چوونیەکی ،یان نزیکیی هەستی دەروون و بۆچوون و بیروڕا . ( هاوڕازی ) .
٢-بوونی باوەڕو متمانە بۆ پاراستنی نهێنی و ڕازی دەروون لەنێوان دوو کەس ، یان پتردا .

amřayî
ئامڕایی :
١-وە بەرگرتنی یەك ڕێگا .
٢-بوونی یەك بیرو باوەڕ و بۆچوون لەنێوان دووکەس ، یان زیاتردا .
٣-هەوڵ و کۆشش بۆ یەك ئامانج و یەك مەبەست .

amsayî
ئامسایی :
بڕ. ئاوسێتی .

amser
ئامسەر :
بڕ. ئاوسەر .

amserî
ئامسەری :
بڕ. ئاوسەری .

amşo
ئامشۆ :
بڕ. ئاموشۆ .

ئامشۆوڕەفت : amşowřefit

بڕ. ئاموشۆکردن .

ئامشۆڕەوت : amşořewt

بڕ. ئاموشۆکردن .

ئامشۆکەر : amşoker

بڕ ئاموشۆکەر .

ئامشۆکەرە : amşokere

بڕ. ئاموشۆکەر ( بۆ مێ ) .

ئامشۆکەردەی : amşokerdey

بڕ. ئاموشۆکردن .

ئامشۆکراو : amşokiraw

بڕ. ئاموشۆکراو .

ئامشۆکردن : amşokirdin

بڕ. ئاموشۆکردن .

ئامشۆکریا : amşokirya

بڕ. ئاموشۆکراو .

ئامشۆکریاگ : amşokiryag

بڕ. ئاموشۆکراو .

ئامشۆکریاو : amşokiryaw

بڕ. ئاموشۆکراو .

ئامقە : amqe

کەسێك کە بەدەست کێشە و تەنگو چەڵەمەوە گیر بخوات . ( گیرۆدە ) .

ئامقە بوون : amqebûn

گیرخواردن بەدەست تەنگو چەڵەمەو گێرە و کێشەی سەختەوە . ( گیرۆدە بوون ) .

ئامك : amik

خوشکی باوك .

ئامڵاندن : amÎandin

ئەنجامدانی سەوداو کڕین و فرۆشتن .

ئامنام : amnam

بڕ. ئاداش .

ئاموتام : amutam

١-بەتەواوی و بێکەمو کووڕی .

٢-مرۆڤ و گیاندار و شتی پارێزراو و زیان پێنەگەییو .

٣-شتی پارێزراو و هەڵگیراو کە سەنگ و قەبارەی کەمیان نەکردبێت .

ئاموچیار : amuçyar

بڕ. ئامۆژگار .

ئاموچیاری : amuçyarî

بڕ. ئامۆژگاری .

ئاموخته : amuxte

بڕ. ئاوێته .

ئاموخته بوون : amuxtebûn

بڕ. ئاوێته بوون

ئاموختەکراو : amuxtekiraw

بڕ. ئاوێتەکراو .

ئاموختەکردن : amuxtekirdin

بڕ. ئاوێته کردن .

ئاموختەکریا : amuxtekirya

بڕ. ئاوێته کراو .

ئاموختەکریاگ : amuxtekiryag

بڕ. ئاوێتەکراو .

ئاموختەکریاو : amuxtekiryaw

بڕ. ئاوێتەکراو .

ئامورز : amuriz

کەسێکە کە لە هەڵە و ناتەواو و گوناه و تاوانی خەڵك ببوورێت .

ڕوێ پەنج نەوبەت سوجدەی خودا بەر

گـــــوناه ئامورزمن خودای بانی سەر (بێسارانی)

ئامورزش: amurziş

چاو پۆشین لەتاوان و بەخشینی تاوانکار .( لێبوردن ) .

ئامورزگار : amurizgar

بـــەخشندەی گونـــــاه و لـــتێبورده ( خـــوا )

غەرقی دەریایی گوناهێن تەشنەیی لوتفا حەقین

ڕەحمەتی ئامـــــــورزگار و شەفقەیی غەففاربەس (مەلای جەزیری)

ئامورزیه : amurzye

کەسێکی تاوانکار ، کەچاوی لێپۆشرابێت و لێبوردرابێت .

ئامورزیده : amurzîde

بڕ. ئامورزیه

amuşo

١-ئاموشۆ :

١-هاتووچۆی میانەی دۆست و خزمان .

٢-جووڵە و گەڕان لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر * ( ئازاد هەمیشە لە ئاموشۆدایە ).

amuşo

٢- ئاموشۆ :

جووڵە و لەرەی شتی هەڵواسراو و شۆرە و بوو بۆ ئەمسەر و ئەوسەر

amuşoker

ئاموشۆکەر :

کەسێك کە هاتووچۆی خزم و دۆستان ، یان شوێنێك بکات

amuşukere

ئاموشوکەرە :

بڕ. ئاموشۆکەر ( بۆ مێ ) .

amuşukerdey

ئاموشوکەردەی :

بڕ. ئاموشوکردن .

amuşokiraw

ئاموشۆکراو :

کەسێکی سەرلێدراو .

amuşokirdin

ئاموشۆکردن :

هاتووچۆکردن و سەردان لە نێوان دراوسێ و خزم و هاورێ و ئاسیاواندا .

amuşukirya

ئاموشوکریا :

بڕ. ئاموشۆکراو .

amuşokiryag

ئاموشۆکریاگ :

بڕ. ئاموشۆکراو .

amuşokiryaw

ئاموشۆکریاو :

بڕ. ئاموشۆکراو .

amuşukiryê

ئاموشوکریێ :

بڕ. ئاموشۆکراو ( بۆ مێ و کۆ ) .

amun

ئامون :

بڕ. ئامان .

amwîr

ئاموير :

بڕ. ١، ٢ ئاموور .

amuîret

ئاموێرەت :

بڕ. ئامراز

amo

ئامۆ :

بڕ. ئاموور .

amoza

ئامۆزا :

١-منداڵی مام .

٢-بنەماڵەی مام

ئامۆزازا : amozaza

منداڵ و نەوەی ئامۆزا

ئامۆزاژن : amozajin

ژنی ئامۆزا .

ئامۆزاگ : amozag

بڕ. ئامۆزا .

ئامۆزگار : amozgar

بڕ. ئامۆژگار .

ئامۆزگاری : amozgarî

بڕ ئامۆژگاری .

ئامۆژ : amoj

بڕ. ئامۆژگاری .

ئامۆژکاری : amojkarî

بڕ. ئامۆژگاری .

ئامۆژگا : amojga

بڕ. ئامۆژگە

ئامۆژگار : amojgar

کەسێك کە بە وتەی بەجێی دڵسۆزانە ڕێنمایی کەسێکی تر بکات ، بۆچاکە کردن و دوورکەوتنەوە لە خراپە .

( هەندێ جاریش ڕێی خراپ پیشاندەدات ) .

ئامۆژگاری : amojgarî

کاری ڕێپیشاندان ، بەوتەی ڕاست و دروست بۆ چاکە کردن و دوورکەوتنەوە لە خراپە .

( هەندێ جاریش بۆ خراپەکاری ) .

ئامۆژگاریکەر : amojgarîker

بڕ. ئامۆژگار .

ئامۆژگاریکراو : amojgarîkiraw

کەسێك کە ئامۆژگاریی کرابێ بۆ چاکە کردن و دوورکەوتنەوە لە خراپە .

( هەندێ جاریش بۆ خراپە کردن ) .

ئامۆژگاریکردن : amojgarîkirdin

ڕێپیشاندان ، بەوتەی ڕاست و دروست بۆ چاکە کردن .

( هەندێ جاریش بۆ خراپەکردن ) .

ئامۆژگاریکریا : amujgarîkirya

بڕ. ئامۆژگاریکراو .

ئامۆژگاریکریاگ : amojgarîkiryag

بڕ. ئامۆژگاریکراو .

amojgarîkiryaw
ئامۆژگاریکریاو :
بڕ. ئامۆژگاریکراو .

amojge
ئامۆژگە :
دامەزراوێکی زانست وخوێندنە دوای پلەی ئامادەیی بۆ خوێندنی جیا جیا .

amojin
ئامۆژن :
ژنی مام .

amojyar
ئامۆژیار :
بڕ. ئامۆژگار .

amojyarî
ئامۆژیاری :
بڕ. ئامۆژگاری .

amojyarîkiraw
ئامۆژیاریکراو :
بڕ. ئامۆژگاریکراو .

amojyarîkirya
ئامۆژیاریکریا :
بڕ. ئامۆژگاریکراو .

amojyarîkiryag
ئامۆژیاریکریاگ :
بڕ. ئامۆژگاریکراو .

amojîkiryaw
ئامۆژیکریاو :
بڕ ئامۆژگاریکراو .

Amon
ئامۆن :
لە ئەفسانەی کۆنی یونانیدا خواوەندی خۆرە .

amû
ئامو :
بڕ. ئاموور

amudî
ئاموودی :
لەرە و هەڵبەزو دابەزی لەش لەسەر ئاوازو گۆرانی و بەستەی تایبەتی .

amûr
١- ئاموور :
ئامێرێکە کە بەگا و گوێدرێژ ، ئێستر ....هتد جووتی پێدەکرێت ، بریتییە لە مژان ، باسکە ، کەللە ، دوندە ،دەستە دوو ، هەپە و .... هتد .

amûr
٢- ئاموور :
بڕ ئامراز

amûr
٣- ئاموور :
لە ئەفسانەی ڕۆمانی کۆندا ،خواوەندی خۆشەویستییە ،کەلە شێوەی مێرمنداڵێکی باڵدار دایە ،تیرو کەوانی بەدەستەوەیە.

amûr
٤- ئاموور :
ئەستێرەیەکی بچووکە ( ١٥ ) ملیۆن کیلۆمەتر لەزەوییەوە دوورە و تیرەکەی ١-٢ کیلۆمەترە .

ئامووڕەت : amûret

بڕ. ئامێر .

ئاموور ڕژدە : amûr rijde

ئامووڕێك كە بەشێوەیەكی وا لە كاردا بێت ، گاسن بە باشی بە زەویدا بچێت و چاك بیكێڵێت .

ئاموورماڵە : amûrmaÎe

ئامووڕێك بەشێوەیەكی وا لەكاردا بێت ، گاسن بەباشی زەوی نەكێڵێت .

ئامووزا : amûza

بڕ. ئامۆزا .

ئامووژار : amûjar

ڕاستكردنەوەی هەڵە و نەهێشتنی ناتەواوی و كەموكووڕی.

ئاموولاقۆزی : amûlaqozî

یارییەكی فۆلكلۆریی منداڵانەی كوردەوارییە، لەنێوان دوو دەستەدا دەكرێت .

١-ئاموون : amûn

ناوی ڕووبارێكە لە ئاسیای ناوەڕاستدا .

* ناوی ئاموون و توونی باباچی .

وەك دوعایەك دەكرێت بەواتای ناوی ئاموون بتبات

ئەی ئیقباڵی من ، هەر سەرنگوون بای

سەرنگوون نە قەعر ناوی ( ئاموون ) بای ( وەلی دێوانە )

٢- ئاموون : amûn

زەویی تەختان و پان و زۆر بەربڵاو كە كشتوكاڵی تێدا دەكرێت . ( دەشت )

ئامیار : amyar

بڕ. ١-ئاوەڵ -١

ئامیان : amyan

ئەو ئەندازە دۆ و ماستەی كە دەكرێتە ناو شیری كوڵا و و شیلەتێن بۆ ئەوەی بمەیەت و ببێت بە ماست .

ئامیانكەر : amyanker

كەسێك كە ئامیانبكات .

ئامیانكەرە : amyankere

بڕ. ئامیانكەر ( بۆ مێ ) .

ئامیانكەردەی : amyankerdey

بڕ. ئامیانكردن

ئامیانكراو : amyankiraw

شیری كوڵاو و شلەتێن كە ئامیانی تێكرابێ .

ئامیانكردن : amyankirdin

تێكەڵكردنی ئامیان لەگەڵ شیری كوڵاوی شلەتێن بۆ ئەوەی بمەیەت و ببێت بە ماست .

ئامیانکریا : amyankirya

بڕ. ئامیانکراو .

ئامیانکریاگ : amyankiryag

بڕ. ئامیانکراو .

ئامیانکریاو : amyankiryaw

بڕ. ئامیانکراو .

ئامیته : amite

بڕ. ئاوێته .

نزیك وه پرشنگ پای قه‌ڵوه‌زان بو

ئامیته‌ی خـــاکم وه‌لگی خه‌زان بو (بێسارانی)

ئامیته ببیه : amîtebiye

بڕ . ئاوێته بوون .

ئامیته‌که‌ره : amîtekere

بڕ. ئاوێته‌که‌ر (بۆ مێ) .

ئامیته‌که‌ر : amîteker

بڕ. ئاوێته‌که‌ر .

ئامیته‌که‌رده‌ی : amîtekerdey

بڕ. ئاوێته کردن .

ئامیته‌کریا : amîtekirya

بڕ. ئاوێته کراو .

ئامیته‌کریاگ : amîtekiryag

بڕ. ئاوێته‌کراو .

ئامیته‌کریاو : amîtekiryaw

بڕ. ئاوێته‌کراو .

ئامیتن : amîtin

بڕ. ئاوێته‌کردن .

ئامیخته : amîxte

بڕ. ئاوێته .

ئامیز : amîz

بڕ. ٢-ئامێز .

دوو عه‌نبه‌ر بو لشمشادی ب مـه‌ستی

ڤه به‌ستن له‌و هه‌وا بۆ عه‌نبه‌ر ئامیز (مه‌لای جه‌زیری)

ئامیزا : amîza

بڕ. ئاده‌می .

amîzad
ئامیزاد :
بڕ ئادەمی .

amîzaye
ئامیزایە :
بڕ. ئادەمی

amîn
ئامین :
وشەیەکە پاش خوێندن و وتنی دوعا و نزا دەوترێت بەنیازی گیرابوون .

amînutamîn
ئامین و تامین :
بڕ. ئاموتام .

amê
ئامێ :
بڕ. ئاما ( بۆ مێ و کۆ ) .

amête
ئامێتە :
بڕ. ئاوێتە .

amêtebûn
ئامێتەبوون :
بڕ. ئاوێتە بوون .

amêteker
ئامێتەکەر :
بڕ. ئاوێتەکەر .

amêtekere
ئامێتەکەرە:
بڕ.ئاوێتەکەر ( بۆ مێ ) .

amêtekerdey
ئامێتەکەردەی :
ئامێتەکردن .

amêtekiraw
ئامێتەکراو :
بڕ. ئاوێتەکراو .

amêtekirdin
ئامێتەکردن :
بڕ. ئاوێتەکردن .

amêtekirya
ئامێتەکریا :
بڕ. ئاوێتەکراو .

amêtekiryag
ئامێتەکریاگ :
بڕ. ئاوێتەکراو .

amêtekiryaw
ئامێتەکریاو :
بڕ ئاوێتەکراو .

amêr
١-ئامێر :
بڕ ئامراز-١

amêr
٢- ئامێر :
کەلوپەلی ئاوماڵ .

amêz
١-ئامێز :
دەست و بازووی کراوە و ئامادە بۆ لەباوەشگرتنی کەسێك ، گیاندارێك ، شتێك .
amêz
٢- ئامێز :
پاشگری هەندێك وشەیە بەواتای تێکەڵ بەوشتە.
کەلامی حیکمەت ( ئامێز ) لە جەنابی شێخ ڕەزاوە بە عەجایبی مەزانن کلکی تیا ڕزاوە . ( شێخ ڕەزا )
amêz
٣- ئامێز :
ئەندازەی ئامێزێك لەهەر شتێك .
amêz
٤- ئامێز :
سەرهەردوو ڕانی مرۆڤ لەکاتی دانیشتنا .
amêzî
١-ئامێزی :
دۆستایەتی و خزمایەتی و هاتوچۆی نێوان مرۆڤ.
amêzî
٢-ئامێزی :
ئاوێتەبوونی چەند شتێك ، یان چەند مژادێك ، یان تێهەڵکێشی شتێك ، یان چەند شتێك بەناو شتی تردا ، یان لەگەڵ شتی تردا .
amêje
ئامێژە :
بڕ. ئامیان .
amêjen
١-ئامێژەن :
ئەو کەمە شتە باشەی کەتێکەڵ بە شتێکی بەدی هاوتوخمی خۆی دەکرێت بە مەبەستی باشکردنی .
*ئامێژەنێك ئاردی گەنم بێنە بۆ ئەم ئاردەجۆیە.
amêjen
٢- ئامێژەن :
بڕ. ئامیان .
amêjenbûn
١-ئامێژەنبوون :
تێکەڵبوونی هەندێك شتی باش لەگەڵ بەشێکی خراپ کە لەهەمان توخم بێت بەمەبەستی چاککردنی .
amêjenbûn
٢- ئامێژەنبوون :
یەکگرتنی تۆوی دووگیاندار و تێکەڵبوونی تۆوی ڕووەك بەمەبەستی بەرهەمهێنانی توخمێکی چاکتر .
amêjenkirdin
ئامێژەنکردن :
١-بڕ. ئامیانکردن .
٢-تێکەڵکردنی کەمێك شتی باش لەگەڵ شتێکی زۆر خراپی لەهەمان توخم و بابەت ، بەمەبەستی چاککردنی.
an
١-ئان :
١- وشەیەکە بەکاردەهێنرێت بۆ جیاکردنەوەی دووشت یان زیاترلەیەکتر.کاتێك کەگومان وحاڵینەبوون سەرهەڵبدەن( یان )
٢- ئامرازێکە بۆ پەسەندکردنی شتێك لە دووشت ، یان زیاتر .
* ئان بێ دەنگ بە ، ئان بنوو .

an
٢- ئان :
ماوه و سەردەم و كات .
بخوێنن چونكە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان
هەموو ئان و زەمانێ عەینی قەڵغان و سوپەرتانە ( ئەحمەد موختار جاف )

an
٣- ئان :
بڕ. ئێسكسووك .

an
٤- ئان :
خواوەندی ئاسمان لە ئەفسانەی كۆتی ئەكەدی و سۆمەریدا .

ana
ئانا :
وشەیەكە بۆ ئاماژەكردنی كەسێك ، یان شتێكی دوور و دەستنیشانكردنی . ( ئەوەتا ) .
:ئانا باخەكە و ئەحمەدی .

anabasîs
١-ئاناباسیس :
كتێبە بەناوبانگەكەی زەینۆفۆنە كە باسی گەڕانەوەی لەشكرە دەهەزار سەربازە یۆنانییەكە دەكات ، لە ئێرانەوە بە كوردستاندا . ساڵی ( ٤٠١ ) پێش عسیا .

anabasîs
٢- ئاناباسیس :
دەوەنێكی كێوییە ، ئاوەكەی ئەگیرێت بۆ سپیكردنەوەی تەنراو بەكاردێت .

anaxdar
ئاناخدار :
ئامرازێكە كە قفڵ و كێلۆنی پێدەكرێتەوە . ( كلیل )

anare
ئانارە :
بڕ. ئانا .

anam
ئانام :
بڕ. ئەندام .

ane
١-ئانە :
بڕ. ئەوە .
ئـــانەگشت جـەوەخت ئـادانیم بییەن
فەسڵی مەستی و عەیش ، جوانیم بییەن ( بێسارانی )

ane
٢- ئانە :
مێینەی ئادەمیزاد كە منداڵی هەبێت .

ane
٣- ئانە
دراوێك بوو هەتا ساڵی ١٩٥٧ لە هیندستان و ساڵی ١٩٦١ لە ئەفغانستاندا بەكار دەهێنرا ،لە عێراق و كوردستاندا ( ٤ ) فلس بوو ، دوایی كرا بە ( ٥ ) فلس ، لەسەردەمی پاشایەتی و سەرەتای چەند ساڵێكی كۆماریدا مابوو .

aneşa
ئانەشا :
بڕ. ئەوەیان

ئانتام : antam

بڕ. ئەندام

ئانتێخ: antêx

داری سووتاندن کە شەو ئەخرێتە بن ژێلەمۆ و خۆڵەمێشەوە ، بۆ ئەوەی کوورە و سۆپا بە گەرمی بمێننەوە و سارد نەبنەوە .

ئانجا : anca

بڕ. ئنجا .

ئەڤ ڕەنگە دکەت مورادی حاصل

ئانجا دبتە مـــوریدیٚ واصـــل (مەم و زین)

١-ئانجاخ: ancax

١- ئەندازەیەکی کەم لەهەرشتێك .

٢-وشەیەکە بۆ دیاریکردن و جیاکردنەوەی مرۆڤ و گیاندار و شت ، لە توخم و ، چەشنی خۆیان .

٢- ئانجاخ: ancax

دەستنیشانکردنی کات و سەردەم .

٣- ئانجاخ: ancax

بەلای کەمەوە .

ئاندە : ande

بڕ. ئەوەندە .

ئاندیدەو ئامین : andîdew amîn

بڕ. ئامین .

(ئاندیدە) بەتەنیا نایەت و لەگەڵ ئامیندا بەکار دێت و زۆرتر بۆ دوعاو نزای خراپە یە .

ئانقەست : anqest

بڕ. ئەنقەست .

ئانکو : anku

بڕ. ١- ئان -١.

ئانگ : anig

بڕ. ٢-ئامێز . (شت و کەلوپەل ) .

ئانگژەبوون : angijebûn

بڕ. ٢-ئامبازبوون .

ئانگسترۆم : angistirom

یەکەیەکی پێوانەی درێژییە و بریتییە لەیەك لەسەر سەد ملیۆن سانتیمەتر ، بۆ پێوانەی درێژیی شەپۆلی تیشك لە ناوێتە سازی زوومسازیدا سازیدا ، لە فیزیای ئەتۆمیدا بەکاردێت و بە ناوی ( ئانگستروم )ی زانای ناوداری سویدییەوە ناونراوە ( ١٨١٤-١٨٧٤ ) .

١-ئانگۆ : ango

وشەیەکە لە ئە نجامی یەکلابوونەوە و دڵنیاییدا دەبێژرێت

۲- ئانگۆ : ango

وشەیەکە بۆدیاریکردنی شێوازو شێوەی ئەنجامدانی کارو مەبەستێك بە گوێرەی ویست و خواست .

۳- ئانگۆ : ango

۱- بڕ. ئینجا .

۲-بڕ : ۱-ئان .

۱-ئانگۆرتی : angortî

۱- چوونیەکی لەبواری ژیان و ئاستی کۆمەلآیەتیدا .

۲-چوونیەکی لە سەنگ و قەبارە و توانا و بەهرە و ڕەفتارو ....هتد ( یەکسانی ) .

۲- ئانگۆرتی : angortî

بڕ. ئەرمو ئارای . ( بەراوردکاری ) .

ئانگۆری : angorî

بڕ. ئانگۆرتی .

ئانگۆریهەڤبوون : angorîhevbûn

۱-هاوسەنگبوون لە کێشانەد ا .

۲-وەك یەکبوون لەهەڵسوکەوت و ڕەفتاردا.

۳-بەرپرسیاربوونی هەمووان لە بواری یەکسانیدا

۱-ئانگۆریهەڤکرن : angorîhevkirin

۱- چونیەککردن لەبواری ژیان و ئاستی کۆمەلآیەتیدا .

۲-چوونیە ککردن لە سەنگ و قەوارەدا .

۲-.ئانگۆریهەڤکرن angorîhevkirin

بڕ ئاوردن .

۳- ئانگۆریهەڤکرن : angorîhevkirin

۱- هاوسەنگکردن لە پێوانەدا .

۲-چاو لە یەککردن لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاردا .

۳-چاودێریکردنی کەسێك کە مەبەستبێت .

ئانها : anha

بڕ. ئێستا .

ئانوئوون : anu ûn

لە نجەو لارو نیو نیگاو چاوی پڕ لە خەمزوناز .

ئانوئوونکرن : anu ûnkirin

لە نجەو لارو نازکردن و قسەکردنی پڕ لە خەمزە و ناز .

ئانوئین : anu în

بڕ. ئانو ئوون .

anoke
ئانۆكە :
بڕ. ئێستا .

anû
ئانوو :
بڕ. ١-ئەندێشە -١

anûha
ئانووها :
بڕ. ئێستا .

anî
ئانی :
بڕ. ئەوە ( بۆ مێ و کۆ ) .

anîbeş
ئانیبەش :
کەسێك کە بۆی نەیەت و لە هیچ کارو مەبەست و پرۆژەیەکدا سەرنەکەوێت . ( بەدبەخت )

anîbeşî
ئانیبەشی :
بارودۆخی کەسێك کە بۆی نەیەت و لە هیچ کارو پرۆژە و مەبەستێکا سەرنەکەوێت . ( بەدبەختی )

anîzaz
ئانیزاز :
بڕ. ئانو ئوون .

anîzazkirdin
ئانیزازکردن :
بڕ. ئانو ئوونکردن .

anîzazî
ئانیزازی :
بارودۆخی ئافرەتی بەناز و عیشوە .

anîsik
١-ئانیسك :
هەناسەی بە تەوژم و کوڵی نزگەرە ئاسا لە ئەنجامی پەنگخواردنەوەی گریانی بەکوڵدا . ( هەنیسك ) .

anîsik
٢- ئانیسك :
بڕ. ئانیشك .

anîskdan
ئانیسکدان :
بڕ. ئانیسکهەڵدان .

anîsikhaÎdan
ئانیسکهەڵدان :
هەناسە وەرگرتنی بەتەوژم و بە کوڵی نزگەرە ئاسا ، لە ئەنجامی پەنگخواردنەوەی گریانی بەکوڵدا . ( هەنیسکهەڵدان ) .

anişa
١- ئانیشا :
بڕ. ئەوەیان ( بۆ مێ ) .

anîşa
٢-ئانیشا :
بڕ. ئەوانە .

anîşik
ئانیشك :
١-جومگەی جەمسەری باسك و بازوو .
٢-کۆتایی ئێسقانی باسك لە ئاستی جومگەی باسك و بازوودا .

anîşke

ئانیشکە :

١-هەر شتێ کە لە شێوەی ئانیشکداگۆشەی پێکهێنابێ .

٢-دارێکە لە شێوەی ئانیشکدا دەبەسترێت بەخوانکەی ئاشەوە بۆ بەرزکردنەوە و نزیکبوونەوەی پێی ئاش بەمەبەستی ورد و درشتهاڕین .

٣- پارچە بۆڕیی گونج کە لە شێوەی گۆشەدا یە بۆ بەستنی دووبەش بەشێوەی گۆشەی وەستاو . ( عەکس ) .

anîmanî

ئانیمانی :

یارییەکی فۆلکلۆریی منالآنە ... هەموو بەیەك ڕیز ڕێك دەوەستن ... دەست دەخەنە سەر شانی یەکتری بەدەستووری هەڵپەرکێ . پایەکیان دەهێننە پێشەوە ، کە هەڵدەپەڕن دەڵێن :

( ئانیمانی ، شانیمانی ، چینی مینی ڕەفت )

دوای وشەی ڕەفت خێرا بێجووڵە لە سەر زەوی دادەنیشن ، هەر کەسێك دوا بکەوێت ، یان لەنگەری تیکبچێت دەخرێت و دەدۆڕێت و دەکرێتە دەرێ . بە مجۆرە تاکو دواکەس دەمێنێتەوە ، کەتاقە براوە و بەرندەیە ، لە پاداشتا بە کۆڵ دەیگێڕن .

anîn

ئانین :

بڕ. ئاوەردەی .

anîneber

ئانینەبەر :

خزمەتکردن و چاودێریکردن و سەرپەشتیکردنی دار و درەخت و ڕووەك هەتا دێنە بەر .

anê

ئانێ :

بڕ. ئەوەتان .

anêre

ئانێرە :

بڕ. ئەوەتان .

anêka

ئانێکا :

١-بڕ.ئاخۆ .

٢-بڕ.ئێستا .

anêle

ئانێلە :

بڕ . ئەوانە .

Aw

١-ئاو :

١- شلەمەنییەکە لە دۆخی ئاساییدا بێچێژ و بێڕەنگ و بۆیە . بەبێ خواردنەوەی هیچ گیاندارو ڕووەکێك ناژی ، لەشێوەی ئۆقیانووس و دەریاو دەریاچە و ڕووبار و کانیدا ، زۆربەی ڕووبەری زەویی دا پۆشیوە .

٢-هەر تەڕاییەکی روونی بێڕەنگ لە تەنی گیاندار و ڕووەکا بێ .

٣-گۆشراوی هەندێ میوە و بەری ڕووەك .

aw

٢-ئاو :

شلەیەکی لینجە ، تۆوی گیانداری تێدایە ، لە ئەندامی جووتبوونەوە دەردەچێ .

aw

٣- ئاو :

بریقە و درەوشانەوەی زێڕ و زیو ...هتد .

٤- ئاو : aw

هێز و توانای بینایی

٥- ئاو : aw

کانی ، چەم ، جۆگە ، زێ ، دەریاو ...هتد .

ئاو ئامای : aw amay

بڕ. ئاو داهاتن .

ئاو ئەرەدای : aw ereday

بڕ. ئاودادان .

ئاو ئەرەمتەی : aw eremtey

ئاو ڕژاندن لە شوێنی بەرزەوە بۆ خوارێ .

ئاو ئەرەمچ : aw eremic

کەسێکە کە لە شوێنی بەرزەوە ئاو بڕژێنێتە خوارێ .

ئاو ئەرەمچە : aw eremice

بڕ ئاو ئەرەمچ ( بۆ مێ ) .

ئاو ئەرەوستەی : aw erewisty

بڕ. ١-ئاودان ١، ٢ .

ئاو ئەنە پژگن : aw enepijgin

بڕ. ئاو لێپرژێن .

ئاو ئەنە پژگنە: aw enepijgine

بڕ. ئاو لێپرژێن ( بۆ مێ ) .

ئاو ئەنە پژگنای : aw enepijginay

بڕ. ئاولێپرژاندن .

ئاو ئەنە پژگنیا : aw enepijginya

بڕ. ئاو لێپرژێنراو .

ئاو ئەنە پژگنیێ : aw enepijginyê

بڕ. ئاولێپرژێنراو ( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .

ئاو ئەنە پژگیا : aw enepijgiya

بڕ. ئاولێپرژاو .

ئاو ئەنە پژگیای : aw enepijgiyay

بڕ. ئاولێپرژان .

ئاونە پژگیێ : aw enepijgyê

بڕ. ئاولێپرژاو . (بۆ مێ و کۆ ) .

ئاونەنەکەردەی : aw enekerdey

بڕ. ئاوتێکردن .

aw ewa ar — ئاو ئەوا ئار :
بڕ. ئەشقپەڕێن .

aw ewa are — ئاو ئەوا ئارە :
بڕ. ئەشقپەڕێن ( بۆ مێ ) .

aw ewa ardey — ئاو ئەوا ئاردەی :
بڕ. ئاوهێنانەوە .

aw ewa arya — ئاو ئەوا ئاریا :
بڕ. ئەشقپەڕێنراو .

aw ewa arbê — ئاو ئەوا ئاربێ :
بڕ. ئەشقپەڕێزاو .

aw ewa ama — ئاو ئەوا ئاما :
بڕ. ئەشقپەڕیو .

aw ewa amay — ئاو ئەوا ئامای :
بڕ. ئاوهاتنەوە .

aw ewa amê — ئا ئەوا ئامێ :
بڕ. ئەشقپەڕیو ( بۆ مێ وبۆ کۆ ) .

aw ewa awer — ئاو ئەوا ئاوەر :
بڕ. ئەشقپەڕێن .

aw ewa awere — ئاو ئەوا ئاوەرە :
بڕ. ئەشقپەڕێن . ( بۆ مێ ) .

aw ewa aweredey — ئاو ئەوا ئاوەردەی :
بڕ. ئاو هێنانەوە

aw ewa awerya — ئاو ئەوا ئاوەریا :
بڕ. ئاو ئەوە ئاوریا .

aw ewa aweryê — ئاو ئەوا ئاوەریێ :
بڕ. ئەشقپەڕێنراو ( بۆ مێ وبۆ کۆ ) .

aw ewa awir — ئاو ئەوا ئاور :
بڕ. ئەشقپەڕێن .

aw ewa awire — ئاو ئەوا ئاورە :
بڕ. ئەشقپەڕێنراو ( بۆ مێ ) .

aw ewa awirdey — ئاو ئەوا ئاوردەی :
بڕ. ئاوهێنانەوە

aw ewa awirya — ئاو ئەوا ئاوریا :
بڕ. ئەشقپەڕێنراو .

aw ewa awiryê

ئاو ئەوا ئاوریێ :

بر. ئەشقپەرێنراو ( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .

aw ewa day

ئاو ئەوا دای :

بر. ئاودانەوە .

aw ewe ar

ئاو ئەوە ئار :

بر. ئەشقپەرێن .

aw ewe are

ئاو ئەوە ئارە :

بر. ئەشقبەرێن ( بۆ مێ ) .

aw ewe ardey

ئاو ئەوە ئاردەی :

بر ئاوهێنانەوە .

aw ewe arya

ئاو ئەوە ئاریا :

بر. ئەشقپەرێزراو .

aw ewe aryê

ئاو ئەوە ئاریێ :

بر. ئاو ئەوە ئاور . ( بۆ مێ و کۆ ) .

aw ewe ama

ئاو ئەوە ئاما :

بر. ئەشقپەریو .

aw ewe amay

ئاو ئەوە ئامای :

بر. ئاوهاتنەوە .

aw ewe amê

ئاو ئەوە ئامێ :

بر. ئەشقپەریو . ( بۆ مێ بۆ کۆ ) .

aw ewe awer

ئاو ئەوە ئاوەر :

بر. ئەشقپەرێن .

aw ewe awere

ئاو ئەوە ئاوەرە :

بر. ئەشقپەرێن . ( بۆ مێ ) .

aw ewe awerdey

ئاو ئەوە ئاوەردەی :

بر. ئاوهێنانەوە .

aw ewe awerya

ئاو ئەوە ئاوەریا :

بر. ئەشقپەرێنراو .

aw ewe aweryê

ئاو ئەوە ئاوەریێ :

بر. ئەشقپەرێنراو .

aw ewe awir

ئاو ئەوە ئاور :

بر. ئەشقپەرێن .

aw ewe awire

ئاو ئەوە ئاورە :

بر. ئەشقپەرێن . ( بۆ مێ ) .

aw ewe awirdey — ئاو ئەوە ئاوردەی :
بڕ. ئاوهێنانەوە .

aw ewe awirya — ئاو ئەوە ئاوریا :
بڕ. ئەشقپەڕێنراو .

aw ewe awiryê — ئاو ئەوە ئاوریێ :
بڕ. ئەشقپەڕێنراو . ( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .

aw eweday — ئاو ئەوەدای :
بڕ. ئاودانەوە .

aw ewew ar — ئاو ئەوەو ئار :
بڕ. ئەشقپەڕێن .

aw ewew are — ئاو ئەوە و ئارە :
بڕ. ئەشقپەڕێن .

aw ewew ardey — ئاو ئەوە و ئاردەی :
بڕ. ئاوهێنانەوە

aw ewew arya — ئاو ئەوە و ئاریا :
بڕ. ئەشقپەڕێنراو

aw ewew aryê — ئاو ئەوە و ئاریێ :
بڕ. ئەشقپەڕێنراو .

aw ewew ama — ئاو ئەوە و ئاما :
بڕ. ئاو ئەوە ئاما .

aw ewew amay — ئاو ئەوە و ئامای :
بڕ. ئاوهاتنەوە .

aw ewew amê — ئاو ئەوە و ئامێ :
بڕ. ئەشقپەڕێنراو ( بۆ مێ و بۆ کۆ) .

awe ewew awer — ئاوە ئەوە و ئاوەر :
بڕ. ئەشقپەڕێن .

awe ewew awere — ئاو ئەوەوئاوەرە :
بڕ. ئەشقپەڕێن ( بۆ مێ ) .

awe ewew awerdey — ئاو ئەوە و ئاوەردەی :
بڕ. ئاوهێنانەوە .

awe ewew awerya — ئاو ئەوە و ئاوەریا :
بڕ. ئەشقپەڕێنراو .

awe ewew aweryê — ئاو ئەوە و ئاوەریێ :
بڕ. ئەشقپەڕێنراو . ( بۆ مێ و بۆ کۆ) .

ئاو ئەوە و ئاور : aw ewew awir

بڕ. ئەشقپەڕێن .

ئاو ئەوە وئاوەر : aw ewew awer

بڕ ئەشپەڕێن ( بۆ مێ ) .

ئاو ئەوەو ئاوردەی : aw ewew awirdey

بڕ. ئاوهێنانەوە .

ئاو ئەوە و ئاوریا : aw ewew awirya

بڕ. ئەشقپەڕێنراو .

ئاو ئەوە و ئاوریێ : aw ewew awiryê

بڕ. ئەشقپەڕێنراو . بۆ مێ و بۆ کۆ .

ئاو ئەوەدای : aw eweday

بڕ. ئاودانەوە .

ئاوئەوۆیار : aw ewoyar

بڕ. ئەشقپەڕێن .

ئاو ئەوۆئارە : aw ewoare

بڕ. ئەشقپەڕێن .( بۆ مێ )

ئاو ئەو ۆ ئاردەی : awewoardey

بڕ. ئاوهێنانەوە .

ئاو ئەوۆئاریا : aw ewoarya

بڕ. ئەشقپەڕێزاو .

ئاو ئەوئاریێ : aw ew aryê

بڕ. ئەشقپەڕێنراو .( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .

ئاو ئەوۆئاما : aw ewo ama

بڕ. ئەشقپەریو .

ئاو ئەوۆئامای : aw ewo amay

بڕ. ئاوهاتنەوە .

ئاو ئەوۆئامێ : aw ewo amê

بڕ. ئەشقپەریو . ( بۆ مێ و بۆکۆ ) .

ئاو ئەوۆئاوەر : aw ewo awer

بڕ. ئەشقپەڕێن .

ئاو ئەوۆئاوەرە : aw ewo awere

بڕ. ئەشقپەڕێن . ( بۆ مێ ).

ئاو ئەوۆئاوەردەی : aw ewo awerdey

بڕ. ئاو هێنانەوە .

ئاو ئەوۆئاوەریا : aw ewo awerya

بڕ ئەشقپەڕێنراو .

ئاو ئەوۆئاوەریێ : aw ewo aweryê

بڕ. ئەشقپەڕێنراو . ( بۆ مێ و بۆکۆ ) .

ئاو ئەوۆئاور : aw ewo awir

بڕ. ئەشقپەڕێن .

ئاو ئەوۆئاورە : aw ewo awire

بڕ. ئەشقپەڕێن . ( بۆ مێ ) .

ئاو ئەوۆئاوردەی : aw ewo awirdey

بڕ. ئاوهێنانەوە .

ئاو ئەو ۆ ئاوریا : aw ewo awirya

بڕ. ئەشقپەڕێنراو .

ئاو ئەو ۆ ئاوریێ : aw ewo awiryê

بڕ. ئەشقپەڕێنراو . ( بۆ مێ و بۆکۆ ) .

ئاو ئەوۆدای : aw ewoday

بڕ. ئاودانەوە .

١-ئاوا : awa

١- شوێنێك کە خانووبەرەی تێدا بێ و خەڵکی تیا بژی .

٢-هەر جێیەك کە گشت و باخاتی تێدا بێ .

٢- ئاوا : awa

وشەیەکە بۆ ڕێنماییکردنی کەسێك بۆ چۆنیەتی ئەنجامدانی کارو مەبەستێك .

* ( ئاوا )دەرمویکە .

٣- ئاوا : awa

دەبێتە پاشگری هەندێ ناو ، واتای شوێنێك دەبەخشێ کە بۆ یەکەمجار کەسێك خانووبەرەی تێدا کردبێ وەك :

ئەحمەد ئاوا ، عەلیاوا .

٤- ئاوا : awa

دەروازە و دەرگاو پەنجەرە ....هتد ، کە کرابنەوە لەسە پشتبن . ( کراوە ) .

٥- ئاوا : awa

هەر شوێن و خانووبەرەیەك کە کوێر نەبووبێتەوە و پڕلە خێر و بێرو مرۆڤ بێت .

٦- ئاوا : awa

شت و گیاندار و مرۆڤی لەچاو ونبوو .

٧- ئاوا : awa

وشەیەکە لە دوای ( ڕۆژ، خۆر ) موە دێت واتای خێ و شوێنی لەچاو ونبوولێمان دەبەخشێت .

ئاوا ئۆك : awa ok

کەسێکە جوونە و کارێکی وا بکات خەڵك بهێنێتە پێکەنین . ( قەشمەرجار ) .

ئاوابوو : awabû

١-ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە و هتد ، لەچاو ونبوو لە ئاسۆدا

٢-مرۆڤی مردوو .

٣-گیاندار و شتی لەچاو ونبوو .

ئاوابوون : awabûn

١-لەچاو ونبوون و نیشتنی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە لە ئاسۆدا .

٢-مردن و کۆچی دوایی مرۆڤ .

٣-لەچاو ونبوونی هەرگیاندار و شتێك لە ئاسۆدا.

ئاوابوونەوە : awabûnewe

بڕ. ئاوەدانبوونەوە .

ئاوابییە : awabiye

بڕ. ئاوابوو

ئاوابییەی : awabiyey

بڕ. ئاوا بوون .

ئاوابیی : awabiyî

بڕ. ئاوابوو ( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .

ئاوات : awat

شتێکی لەناخدا ڕەچاوکراو ، کە خۆزگەی بۆ بخوازرێ ، هەوڵی بۆ بدرێ .

* بەئاواتی خۆمان شاد دەبین

ئاواتەخواز : awatexiwaz

کەسێك کە لەناخەوە بە ئاوات بێ بۆ بەدیهاتن و بەدەستهێنانی نیازو ئارەزووی گیانی و دەروونی .

ئاواتە خوازی : awatexiwazî

بڕ . ئومێدەواری .

ئاواتە خواست : awatexiwasit

بڕ. ئاواتە خواز .

ئاواتە خواستە : awatexiwaste

کەسێك ، کارو مەبەستێك کە زۆر بە تامەزرۆیی ئاواتی بۆ بخوازرێ .

ئاواتە واز : awatewaz

بڕ. ئاواتە خواز.

ئاواتە وازە : awatewaze

بڕ. ئاواتە خواز . ( بۆمێ)

awatewazî ئاواتەوازى :
بڕ. ئومێدەوارى .

awatewaste ئاواتە واستە :
بڕ. ئاواتە خواستە .

awatewastey ئاواتە واستەى :
بڕ. ئومێدەوارى .

awatewastî ئاواتە واستى :
بڕ. ئاواتە خواستە . ( بۆ مێ و کۆ ) .

awatboxiwastin ئاوات بۆ خواستن :
بڕ. ئارەزوو بۆ خواستن .

awatpenewazya ئاواتپەنەوازیا :
بڕ. ئاوات پێخوازراو .

awatpenewazyê ئاواتپەنەوازیێ :
بڕ ئاواتپێخوازراو . ( بۆ مێ و بۆکۆ ) .

awatpeywastey ئاواتپەى واستەى :
بڕ. ئاوات بۆ خواستن .

awatpenewazya ئاواتپەنەوازیا :
بڕ. ئاواتپێخوازراو .

awatpinewazyê ئاواتپنەوازیێ :
بڕ. ئاوا تپێخوازراو . (بۆ مێ و بۆکۆ ).

awatpêxiwazraw ئاوات پێخوازراو :
کەسێك کە خەڵك پێیان خۆشبێ وەکو ئەوبن .

awatpêxiwastin ئاوات پێخواستن :
ئاوا تخواستنى خەڵك بەکەسێك بەو هیوایەى کە وەکو ئەو بن .

awatpêkhatin ئاوات پێکهاتن :
جێبەجێبوون و هاتنە دیى ئاوات و مەبەست و خواست .

awatxiwaz ئاوا تخواز :
بڕ. ئاواتە خواز

awatxiwazraw ئاوا تخوازراو :
بڕ. ئاواتە خواستە .

awatxiwazî ئاوا تخوازى :
بڕ. ئومێدەوارى .

ئاوا تخواستن : awatxiwastin

١-ڕەچاوکردنی هەر ئامانج و کارو مەبەست و شتێك ، خۆگە خواستن بۆیان .

٢-پاڕانەوە و تکاکردن لە یەزدانی مەزن بۆ بەدیهاتنی نزاو نیاز .

ئاواتواز : awatwaz

بڕ. ئاواتە خواز .

ئاواتوازە : awatwaze

بڕ. ئاواتەخواز . ( بۆمێ ).

ئاواتواستە : awatwaste

بڕ. ئاواتە خواستە .

ئاواتواستەی : awatwastey

بڕ. ئاوا تخواستن .

ئاواتوەستە : awatweste

بڕ. ئاواتەخواز

بگێڕەش بەدەست ، هەی ئاواتوەستە

بەرەش وەیانان ، ئایــر جێ نەستە (بێسارانی )

١-ئاواتی : awatî

بڕ . ئاواتە خواستە .

٢- ئاواتی : awatî

بڕ. ئاواتە خواز .

٣- ئاواتی : awatî

شتێك کە بایەخدار بێت و زۆر بە زەحمەت و گران دەستبکەوێت .

٤- ئاواتی : awatî

کورپەی نێرینەی چاوەڕێکراو پاش ماوەیەکی دووروودرێژ .

ئاواج : awac

بڕ. ئاواز .

ئاواخت : awaxit

بڕ. ئارەزوو .

ئاوادان : awadan

بڕ. ئاوەدان .

ئاوادانی : awadanî

بڕ. ئاوەدانی .

١-ئاوار : awar

خواردەمەنییەکی شیرینە ، دۆشاو دەکوڵێنرێ وکــەم کــەم ئارد ، یــان نیشاستەی تێدەکــرێ ، تێکــئەدرێ هەتـا خەست نەبێتەوە و دەکرێتە سەر سینی ،یان دەفرێکی پان ، کەسارد بووەوە ،بەچەقۆ دەبڕدرێ و پارچە پارچە دەکرێ ( باسووق ).

٢- ئاوار : awar

کەسێکە کە لەماڵدا چالێنان و چاتێکردنی پێسپێردرابێ ( چاپەست ) .

٣- ئاوار : awar

سەربان و دیواری داتەپیوو دارووخاو .

٤- ئاوار : awar

مرۆڤی بێکارە و تەمبەڵ و لە شقورس .

٥- ئاوار : awar

شیلەی گوڵ کە هەنگ دەیمژێت و دوایی دەیکات بە هەنگوین .

٦- ئاوار : awar

بڕ . ئاودار .

١-ئاوارە : aware

١- مەردومی دەرکراو لە ئاوایی و شار و وڵاتی خۆی .

٢-کەسێك کە بۆ بەدەستهێنانی بژێوی و پێداویستی ژیان شارەو شارو وڵاتە وڵات بکات .

٣-دەربەدەر و وێڵ و سەرگەردان .

٢-ئاوارە : aware

ئەو ئەختە ئاوە کە هەنگ بەلاقەکانی لەکانی و چەمەوە دەییات بۆ پوورەکەی .

ئاوارەبوو : awarebû

بڕ. ئاوارە – ١ ، ٢

ئاوارەبوون : awarebûn

١-دوورکەوتنەوە لە نیشتمان .

٢-شار بەشار و وڵاتە و لاتگەڕان بە دوای بژێوی و ئەوەشتی ژیاندا .

٣-بێلانە بوون و دەربەدەر بوون.

ئاوارەبییە : awarebiye

بڕ. ئاوارە ١، ٢

ئاوارەبیی : awarebiyî

بڕ. ئاوارە ١، ٢ ( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .

ئاوارەبییەی : awarebiyey

بڕ. ئاوارەبوون .

ئاوارەتی : awaretî

بڕ. ئاوارەیی .

ئاوارەکەر : awareker

ئەو کەسەی ، کە کەسانی تر ئاوارە دەکات .

ئاوارەکەرە : awarekere

بڕ. ئاوارەکەر . بۆ مێ

ئاوارەکەردەی : awarekerdey
بڕ. ئاوارەکردن .
ئاوارەکراو : awarekiraw
کەسێکە کە دەربەدەر و سەرگەردان کرابێ .
ئاوارەکردن : awarekirdin
بێلانەکردن و دەربەدەرکردن و دوورخستنەوە لەخاك و نیشتمان .
ئاوارەکریا : awarekirya
بڕ. ئاوارەکراو .
ئاوارەکریاگ : awarekiryag
بڕ.ئاوارەکراو.
ئاوارەکریاو : awarekiryaw
بڕ. ئاوارەکراو .
ئاوارەکریێ : awarekiryê
بڕ. ئاوارەکراو . ( بۆ مێ و بۆ کۆ )
ئاوارەگا : awarega
ئەو شوێنەی کە بۆ ماوەیەك ئاوارەی تێدا بمێنێتەوە و تێدا بژی .
ئاوارەگی : awaregî
بڕ. ئاوارەیی .
ئاوارەیی : awareyî
١-بارودۆخی کەسێك ، یان کۆمەڵێکی دەرکراو لەخاك و نیشتمان .
٢-بارودۆخی کەسێك کە بۆ بژێوی و نەوەشتی ژین شار بەشار و وڵاتە و وڵات بکات .
٣-باری مرۆڤی دەربەدە و سەرگەردان .
٤-مرۆڤ و گیاندار و شتی جیاکراوە و دەربواردراو .
ئاوارتن : awartin
١-جیاکردنەوە و دەربواردنی مرۆڤ و گیاندار و هەر شتێك لە توخمی خۆی .
٢-جیاکردنەوە و دەربواردنی هەر شتێك و هەر گیاندارێك لەناو کۆمەڵێگا کە لە توخمی یەکتر نەبن .
١-ئاوارخانە : awarxane
جێ و شوێنی چاو قاوەلێنان لەناو ماڵا .
٢- ئاوارخانە : awarxan
شوێنی تەرخانکراو لەماڵا بۆ دانانی کوندە و مەشکە . ( کوندەڵان ) .
٣- ئاوارخانە : awarxane
دووکان و شوێنی فراوان کە کورسی و مێزی زۆری تێدایە ، بۆ پشوودان و دانیشتن و چا خواردنەوە و کات بەسەربردن
(چایخانە ، قاوەخانە ) .

٤- ئاوارخانە : awarxane

کووپە و مەرکانە و دەفری مەزن و گەورە کەلە سەرمڕێ و شوێنە گشتییەکاندا دادەنرێت بۆ ئاو خواردنەوە .

ئاواردە : awarde

بڕ. ئاوارتە .

١-ئاواردن : awardin

وێناکردن هەڵسەنگاندنی دوو شت ، دووکەس ، دووگیاندار ، یان زیاتر بە مەبەستی دەرخستنی لایەنی چاکە و خراپەیان .

٢- ئاواردن : awardin

بڕ.ئاوارتن

ئاواری : awarî

کەلو پەل و بابەتی بارکراوی چاو قاوە ، کەلە جێیەکەوە بگوێزرێتەوە بۆ شوێنکی تر .

ئاواز : awaz

١-هەواو شێواز و شێوەی گوتنی سروود و گۆرانی بە گوێرەی سۆز و نۆتەی تایبەت.

٢-شێوە و شێوازی دەرهێنانی جۆری سۆز و نۆتە بە ئامێری مۆسیقا .

٣-بانگ و دەنگی بەرز و بلند .

١-ئاوازە : awaze

بڕ. ئاواز .

٢- ئاوازە : awaze

دەنگو باسی بلاَوە بوو.

*ئاوازەیەك داکەوتگە ، کە لەمەولا بە ئازادی دەژین .

٣- ئاوازە : awaze

ناو ناوبانگی کەسێك ( شۆرەت ) .

ئاوازەبێژ : awazebêj

بڕ. ئاوازەخوان .

ئاوازەبێژی : awazebêjî

بڕ. ئاوازە خوانی

ئاوازەخوان : awazexiwan

١-کەسێکە کە لەسەر ئاواز گۆرانی دەچڕێ .

٢-کەسێکە کە لەدیوەخان و قاوەخانە و چایخانەدا بە ئاواز و سۆزەوە بەیت و هۆنراوە و داستان دەخوێنێتەوە.

ئاوازەخوانی : awazexiwanî

١-چڕینی سروود و گۆرانی لەسەر ئاوازی تایبەتی.

٢-وتن و خوێندنەوەی بەیت و هۆنراوە و داستان بە ئاوازەوە .

ئاوازەخوەن : awazexiwen

بڕ. ئاوازە خوان .

ئاوازە خوەنی : awazexiwenî
بڕ. ئاوازە خوانی .
ئاوازەخوێن : awazexiwên
بڕ. ئاوازە خوان .
ئاوازەدار : awazedar
١- هەر دەنگێك كە شێوەی ئاواز و گۆرانی هەبێ .
٢- پارچە موسیقا و گۆرانی و سروود و بەستە و ..هتد كە ئاوازی تایبەتیان هەبێ .
٣-هۆنراوە، كە كێش و سەروای تەواوی هەبێت .
ئاوازە داری : awazedarî
بڕ.ئاهەنگداری .
ئاوەزە وەن : awezewen
بڕ. ئاوازە خوان .
ئاوەزە وەنە : awazewene
بڕ. ئاوازخوێن ( بۆ مێ ) .
ئاوازە وەنەی : awazeweney
بڕ.ئاوازە خوانی
ئاوازبێژ : awazbêj
بڕ. ئاوازە خوان .
ئاواز خوان : awazxiwan
بڕ . ئاوازە خوان .
ئاواز خوەن : awazxiwen
بڕ. ئاوازە خوان .
ئاواز خوێن : awazxiwên
بڕ. ئاوازە خوان
ئاوازخوێندن : awazxiwêndin
بڕ. ئاواز خوانی .
ئاواز دار : awazdar
بڕ. ئاهەنگداری .
ئاوازداری : awazdarî
بڕ. ئاوەدار
ئاواز دانان : awazdanan
نووسینی نۆتە ، یان دۆزینەوەی هەواو سۆزی تایبەت بۆ گوتنی دەقی هۆنراوە بەشێوەی گۆرانی و سروود ، یان لێدانی پارچە مۆسیقایەك .

awazdaner
ئاوازدانەر:
کەسێکە کە ئاواز دابنێ .

awazder
ئاوازدەر :
کەسێك کە بەدەنگی بەرز هاوار و بانگ بکاتە کەسانی تر

awazkiraw
ئاوازکراو :
کەسێك ، یان چەند کەسێك بە دەنگ و هاواری بڵند بانگ کرابن .

awazkirdin
ئاوازکردن :
چڕین و بانگکردن بە دەنگی بڵند .

awaznik
ئاوازنك :
بڕ. ئاوازنگ .

awaznig
١-ئاوازنگ :
ناو زڕاندن لە ئەنجامی کارو ڕەفتار و قسەی نابەجێدا .

awaznig
٢- ئاوازنگ :
مرۆڤی بەدناوکراو و ناو زڕێنراو .

awaj
ئاواژ :
بڕ ئاوەژوو .

awajkirdin
ئاواژکردن :
بڕ.ئاوەژووکردن .

awajkirin
ئاواژکرن :
بڕ. ئاوەژووکردن .

awajû
ئاواژوو :
بڕ ئاوەژوو .

awajûbûn
ئاواژووبوون :
بڕ ئاوەژووبون

awajûkirdin
ئاواژووکردن :
بڕ. ئاوەژووکردن .

awasîn
ئاواسین :
بڕ. ئاوێزانکردن .

awaq
١-ئاواق :
بڕ. ئەبڵەق

awaq
٢- ئاواق :
١-شوێن و ماڵ و خانووبەرەیەك کە چۆڵبن و کەسیان تێدا نەژی .
٢-دەشتو دەری کاکی بەکاکی .

٣- ئاواق : awaq

هەر شتێ بەتاڵبێ و هیچی تێدا نەبێ .

٤- ئاواق : awaq

شوێن و ناوچەی ماوی و بێناو و بێشینایی .

١-ئاواقین : awaqîn

بڕ. ئاوارەکردن .

٢- ئاواقین : awaqîn

بڕ. ئاژوتن . ١-٢

٣- ئاواقین : awaqîn

دەرفەتپێدان و ڕێپێدان .

٤- ئاواقین : awaqîn

خۆشاردنەوە و پەناگرتن .

ئاواك : awak

هەڵوێست و ڕەفتار و وتەی بەرپێچ بۆ بەرپەرچدانەوە و ئەنجامنەدانی کارو مەبەست( بیانوو ).

ئاواکاری : awakarî

بڕ. ئاوکردنەوە .

ئاواکەردەی : awakerdey

بڕ. ئاواکردن .

١-ئاواکراو : awakiraw

شوێنێك کە خانوو بەرە و کشتوکاڵ و باخی تیا کرابێ .

٢- ئاواکراو : awakiraw

دوو دەری دەربز و دەرگا و پەنجەرەی کراوە .

ئاواکردە : awakirde

١-بڕ ئاواکردن .

٢-بڕ. ئاواکەر .

١-ئاواکردن : awakirdin

١-دروستکردنی خانوو بەرە لە شوێنێکا و نیشتەجێبوونی کۆمەڵێ مەردوم تیایدا .

٢-چاککردنی زەوی و زار و کشتکردن و دانانی باخات تیایدا .

٢- ئاواکردن : awakirdin

کردنەوە و خستنە سەر پشتی دەرگا و پەنجەرە .

٣- ئاواکردن : awakirdin

ڕفاندن و شاردنەوە و حەشاردان و سەرنگونکردنی کەسێك ، گیاندارێك ، شتێك .

٤- ئاواکردن : awakirdin

دەرکردن و ڕاونان و دوورخستنەوەی مرۆڤ و گیانداری زیانبەخش .

awakirdnewe

ئاواکردنەوە :

١-دروستکردنەوەی خانوو بەرە و لە دێ و شاری وێرانکراودا و نیشتەجێبوون تیایاندا .

٢-دانانەوەی باخ و باخاتی وشك و وێرانکراو.

٣-چاککردنەوەی زەویو زارو کشتکردنی .

awakirya

ئاواکریا :

بڕ. ئاواکراو .

awakiryag

ئاواکریاگ :

بڕ. ئاواکراو .

awakiryaw

ئاواکریاو :

بڕ. ئاواکراو .

awakiryê

ئاواکریێ :

بڕ ئاواکراو ( بۆ مێ و بۆ کۆ )

awakî

ئاواکی :

بڕ. ٢. ئاوا

awaĵ

١-ئاواڵ :

بڕ. ئاوەڵ .

awaĵ

٢- ئاواڵ :

بڕ. ئاوەڵمندالْ .

awaĵa

ئاواڵا:

بڕ. ٤.ئاوا .

awaĵabûn

ئاواڵابوون :

بڕ. ئاوەڵەبوون .

awaĵakiraw

ئاواڵاکراو :

دەرگاو پەنجەرەو سندووقی کراوە .

awaĵakirdin

ئاواڵاکردن :

بڕ ئاواڵەکردن .

awaĵayetî

ئاواڵایەتی :

بڕ. ئاوەڵایەتی .

awaĵe

١-ئاواڵە :

١-بڕ. ٤-ئاوا .

٢-بڕ. ئاشکرا ١، ٢

awaĵe

٢- ئاواڵە :

بڕ. ئەبلەق .

۳- ئاواڵە : awaÎe

دوو کەس ، دوو گیاندار ، دووشت ، یان زیاتر کە لەیەك جیابنەوەو لەیەك بترازێن .

٤- ئاواڵە : awaÎe

شوێن و شتی بەتاڵ کە هیچیان تێدا نەبێ .

١-ئاواڵەبوون :

١- کرانەوە و لەسەر پشتبوونی دەرگاو پە نجەرە و هتد .

٢-سەردانە پۆشرانی دەفر و شتی دی .

٣-کرانەوە و دا پچڕانی دەم .

٢- ئاواڵەبوون : awaÎebûn

لەبەردا نەمانی جلو بەرگ و پۆشاك و ڕووتبوونەوە .

ئاواڵەبییەی : awaÎebiyey

بڕ. ئاواڵەبوون .

ئاواڵەتی : awaÎetî

بڕ. ئاوەلأیەتی .

ئاواڵەکەردەی : awaÎekerdey

بڕ.ئاواڵەکردن .

١-ئاواڵەکراو : awaÎekiraw

بڕ. ئاشکراکراو .

٢- ئاواڵەکراو : awaÎekiraw

بڕ. ٤.ئاوا .

٣- ئاواڵەکراو : awaÎekiraw

هەر دەفر و شتێك کە سەر و سەرقا پی لابرابێ .

٤- ئاواڵەکراو : awaÎekiraw

مرۆڤێك کە جلو بەرگی لەبەر داکەندرابێ .

١-ئاواڵەکراوی : awaÎekirawî

بارودۆخی دەرگا و ، پە نجەرە و ... هتد کراوە .

٢- ئاواڵەکراوی : awaÎekirawî

بارودۆخی دەفر و کاسە و کەوێل و دەفری سەرلابراو .

٣- ئاواڵەکراوی : awaÎekirawî

بارودۆخی دەمی کراوە و دا پچڕاو .

١-ئاواڵەکردن : awaÎekirdin

بڕ. ئاشکراکردن .

٢- ئاواڵەکردن : awaÎekirdin

کردنەوەی دەرگاو پە نجەرە و .... هتد .

awalekirdin ٣- ئاواڵەکردن :

لابردنی سەری مەنجەڵ و دەفرو شتی سەر داپۆشراو .

awaÎekirdin ٤- ئاواڵەکردن :

کردنەوە و داپچڕاندنی دەم .

awaÎekirdinewe ئاواڵەکردنەوە :

چۆڵکردنی شوێن ، خانووبەرە و ، هتد .

awaÎekirya ئاواڵەکریا :

بڕ. ئاواڵەکراو .

awaÎekiryag ئاواڵە کریاگ :

بڕ. ئاواڵەکراو .

awaÎekiryaw ئاواڵەکریاو :

بڕ. ئاواڵەکراو .

awaÎekiryê ئاواڵەکریێ :

بڕ. ئاواڵەکراو ( بۆ مێ و بۆ کۆ ) .

amaÎdaman ئاماڵدامان :

بڕ ئاودامان .

awaÎdan ئاواڵدان :

بڕ. ئاوڵمنداڵ.

awaÎderis ئاواڵدەرس :

بڕ. ئاوەڵدەرس

awaÎzawa ئاواڵزاوا :

بڕ. ئاوەڵزاوا

awaÎkiras ئاواڵکراس :

بڕ. ئاوەڵکراس

awaÎminaÎ ئاواڵمناڵ :

بڕ. ئاوەڵدان .

awaÎmindaÎ ئاواڵمنداڵ :

بڕ. ئاوەڵدان .

awan ١-ئاوان :

١- دەفرێکی قووڵە لە زەرد ، یان لە مس دروستدەکرێت ، بۆ کوتان و وردوخاشکردنی هەندێ شت بەکاردەهێنرێ .

٢-کاسە و قاپ و دەوری ناوماڵ .

awan ٢- ئاوان :

بڕناشانە .

awan
٣- ئاوان :
بڕ. ئاوەدان .
awan
٤- ئاوان :
١- شوێن و ناوچەی گوشادو بەرچاو فراوان .
٢-جلو بەرگ و پۆشاکی گوشاد و پانوپۆڕ .
awan
٥- ئاوان :
مرۆڤی بێشانس و بێبەخت .
awan
٦- ئاوان :
مرۆڤی بێئەمەك و سپڵە و هیچ لەبەرچاو نەبوو .
awan
٧- ئاوان :
بڕ. ئاورنگ .
awan
٨- ئاوان :
مرۆڤێك کە جێی متمانە نەبێ و نهێنی و پەیمان نەپارێزێ و ڕاستی لە هاورێ و هاوڵاتیانی بڵێ و و یارمەتیی دوژمن بدات .
( ناپاك ) .
awanaş
ئاواناش :
بڕ. ١ - ئاشانە .
awane
ئاوانە :
بڕ. ١- ئاوان -١
awante
ئاوانتە :
سامان و شتی خەڵکی ، کە بە خۆڕایی و بەلاش ببرێن و بخورێن . (لرف ، هەوانتە ) .
awanteçî
ئاوانتەچی :
کەسێك کە بە بەلاش و خۆڕایی شتی مەردم ببا و بیخوا ( لرفلێدەر ) .
awanuřewan
ئاوانوڕەوان :
بڕ. ئاوەنوڕەوان .
awanî
١- ئاوانی :
پشتگیریی دوژمن و دوژمنایەتی لەگەڵ دۆست و هاوولاتی و هاوخوێندا . (ناپاکی ) .
awanî
٢- ئاوانی :
بڕ. ئاوەدانی .
awanî
٣- ئاوانی :
بڕ. ئاوایی .
awawok
ئاوا و ۆك :
کەسێکی چەنە بازو زۆر بڵێ کە بە تەوسەوە گاڵتە بەخەڵك بکات .
awawik
ئاواوك :
بڕ. ئاواوۆك .

awayî
١-ئاوایی :
شوێنێکە لە شارۆکە بچووکترە و خەڵکی تێدا دەژی. (گوند)
awayî
٢- ئاوایی :
بڕ. ٢ ئاوا
awayî
٣- ئاوایی :
جۆر و چەشنی هەرگیاندار و شتێك .
awebare
ئاوەبارە :
بڕ. ئاو بارە .
aweçoř
١-ئاوەچۆڕ :
١-ئاوی داچۆڕاو لە شتێك کە لە ئاو هەڵکێشرابێت ، یان زۆر تەڕ بووبێت ، ، یان کەوتبێتە ئاوەوە .
٢-ئارەقی زۆر کە لەشی گیاندار دەریدەدات و تك تك دێتە خوارێ .
٣-چۆڕاوگەی باران کە بەدیوار و پاساردا دێتە خوارێ .
٤-چکچك و کەمکەم ئاوی بەفری تواوە .
aweçoř
٢- ئاوەچۆڕ :
سامان و دارایی لە کیسچوو .
aweçoře
ئاوەچۆڕە :
بڕ. ئاوەچۆڕ.
aweçořbû
ئاوەچۆڕبوو :
جلو بەرگ و هەرشتێك کە دوا چۆڕی ئاویان چۆڕابێتەوە .
aweçořbûg
ئاوە چۆڕبووگ :
بڕ. ئاوەچۆڕبو .
aweçořbûn
١-ئاوەچۆڕبوون :
١- داچۆڕانی ئاوی جلو بەرگ و شتی هەڵواسراوی تەڕ.
٢-داچۆڕانی ئاوی بەفری تواوە .
aweçořbûn
٢- ئاوەچۆڕبوون :
لەدەسچوونی سامان و دارایی (لاتبوون ) .
aweçuřbiye
ئاوەچوڕبییە :
بڕ . ئاوە چۆڕبوو .
aweçuřbiyî
ئاوەچوڕبیی :
بڕ. ئاوەچۆڕبوو ( بۆ مێ و بۆ کۆ) .
aweçuřbiyey
ئاوەچوڕبییەی :
بڕ. ئاوەچۆڕبوون .
aweçuřkerdey
ئاوەچوڕکەردەی :
بڕ. ئاوەچۆڕکردن .

ئاوەچۆڕکراو : aweçořkiraw

تەنراو و جلو بەرگی شۆردراو کە گوشراپن و ئاوەچۆڕکراپن .

ئاوەچۆڕکردن : aweçořkirdin

داچۆڕانی ئاوی تەنراو و شتی تەڕی هەڵخراو بەفری تواوە .

ئاوەچۆڕکریا : aweçořkirya

بڕ. ئاوەچۆڕکراو .

ئاوەچۆڕکریاگ : aweçořkiryag

بڕ.ئاوەچۆڕکراو .

ئاوەچۆڕکریاو : aweçořkiryaw

بڕ. ئاوەچۆڕکراو .

ئاوەچۆڕگە : aweçořge

هەرشوێنێك کە ئاوی چۆڕاوەی پێدا بڕوات

ئاوەچۆڕهێنانەوە : aweçořhênanewe

١- نەمانی هێز و توانای گیاندار لە ئەنجامی ماندووبوون و ئیشکردنی زۆردا .

٢-نەبوونی دەرەتان و کز بوونی باری ئابووری .

ئاوەخانە : awexane

گلێنە ، قوتوو ، شووشەی چەسپکراو بە کونی تەختی بێشکەی منداڵەوە ، بۆ میزتێکردن بە هۆی بلوێرەوە .

ئاوەخت : awexit

بڕ. ئاوات .

ئاوەختخواز : awetxiwaz

بڕ. ئاواتەخواز .

ئاوەخۆر : awexor

١- جام ، یان هەر دەفرێکی تر کە ئاوی پێبخورێتەوە .

٢-قەراخ کەناری جۆگە و رووبار و کانی بۆ ئاوبردن و ئاو خواردنەوە .

ئاوەخۆرانە : awexorane

مزی ئاو خواردنەوە ... باجێك بووە کە دەربەگەکان لەسەر وڵاخی بەرزە و ڕان و ئاژەڵ دایاننـاوە ، کە بە قەڵەمڕەویاندا گوزەریانکردبێت .

١-ئاوەخۆرە : awexore

کلۆری لوولە ئاسای ئاوکرۆکی دار و درەخت ، کە بە هۆیەوە ئاو و خۆراك لەڕەگ و ڕیشەوە دەڕوات بۆلقو پۆپ و گەڵاکان .

٢- ئاوەخۆرە : awexore

لوولەیەکی لینجە ، لە دەمەوە خواردن و خواردنەوەی پێدا دەچێتە خوارێ بۆ ئاو ورگی گیاندار .

٣- ئاوەخۆرە : awexore

ئەو بەشەی لچ و لمۆز و قەپۆزی وڵاخ کە لەکاتی ئاو خواردنەوەدا دەنیشێتە ئاو ئاو .

٤- ئاوەخۆرە : awexore

ڕاوی کەو باڵندەو حەیوانە کێوی لە کاتێکدا کە دێن بۆ سەرکانی بۆ ئاو خواردنەوە .

ئاوەخۆرەوە : awexorewe

بڕ. ئاوخۆرە .

١-ئاوەدان : awedan

بڕ. ١، ٢ ئاوا .

٢- ئاوەدان : awedan

مرۆڤی زۆرزان و مەند کە نیاز و مەبەست لە دڵی خۆیدا نەهێڵێتەوە و نایدرکێنێ .

مولاقاتشان کەو ، جەکام هەردەن

کام ویرانە شان ( ئاوەدان ) کەردەن . ( مەولەوی )

ئاوەدانەکەردەی : awedanekerdey

بڕ. ئاواکردنەوە .

ئاوەدانەکراو : awedanekiraw

خانوو بەرە و گوند و شارۆچکە و هتد کەدوای ڕووخاندن و کاولکردن و کاولبوونیان دروستکرابنەوە .

ئاوەدانەوکردن : awedanewkirdin

بڕ. ئاواکردنەوە .

ئاوەدنەوکریا : awednewkirya

بڕ. ئاوەدانەوکراو .

ئاوەدانەوکریاگ : awedanewkiryag

بڕ. ئاوەدانەوکراو .

ئاوەدانەوکریاو : awedanewkiryaw

بڕ. ئاوەدانەوکراو

ئاوەدانبوونەوە : awedanbûnewe

دروستبوونەوەی خانووبەرە و گوند و شارۆچکە و شارو ....هتد ، وێرانکراو و نیشتەجێبوونەوەی هاووڵاتییان تیایاندا.

ئاوەدانکەر : awedanker

بڕ. ئاواکەر .

ئاوەدانکەردەی : awedankerdey

بڕ. ئاواکردن .

ئاوەدانکراو : awedankiraw

بڕ. ١-ئاواکراو .

ئاوەدانکردن : awedankirdin

بڕ. ئاواکردن .

ئاوەدانکردنەوە : awedankirdinewe

بڕ. ئاواکردنەوە .

ئاوەدانکریا : awedankirya

بڕ. ئاواکراو .

ئاوەدانکریاگ : awedankiryag

بڕ. ئاواکراو .

ئاوەدانکریاو : awedankiryaw

بڕ.ئاواکراو .

ئاوە دانۆکەردەی : awedanokerdey

بڕ. ئاواکردنەوە .

ئاوەدانۆکراو : awedanokiraw

بڕ . ئاوەدانەکراو .

ئاوەدانۆکردن : awedanokirdin

بڕ. ئاواکردنەوە .

ئاوەدانۆکریا : awedanokirya

بڕ. ئاوەدانەوکراو .

ئاوەدانۆکریاگ : awedanokiryag

بڕ. ئاوەدانەوکراو .

ئاوەدانۆکریاو : awedanokiryaw

بڕ. ئاوەدانەوکراو .

ئاوەدانکریێ : awedankiryê

بڕ. ئاوەدانەوکراو . بۆ مێ و بۆکۆ .

ئاوەدانی : awedanî

١-بڕ. ئاوایی .

٢-شوێنێك کە خەڵك و دانیشتوانی تێدا بن .

ئاوەدز : awediz

بڕ. ئاودز .

ئاوەدزبوون : awedizbûn

بڕ. ئاودز بوون .

ئاوەدزکردن : awedizkirdin

بڕ. ئاودزکردن .

ئاوەر : awer

دەبێتە پاشگری ناوی گیاندار و شت ، واتای هێنەریان پێدەبەخشێت .

*کوڕەکە پایەمناوەری خاسا .

